# پرۆژەی تـوێـژیـنـەوەی جـیـهـانـی

## دەزگای ئایدیا بۆ فكرو لێكۆڵینەوە

---


خاوەنی ئیمتیاز
دەزگای ئایدیا

لێپرسراوی دەزگا
ئەنوەر حسێن

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ئەرسەلان حەسەن






2016




خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنور حسێن

www.ideafoundation.co
info@ideafoundation.co
idea@ideafoundation.co
www.facebook.com/dezgai.idea
053 330 0391 - 0770 195 5044

**ناوی کتێب: دەروازەیەك بۆ ناسینی جەنگ جەنگی عیراق – کوەیت وەك نمونە**
**بابەت: توێژینەوەی سیاسی**
**ناوی نووسەر: هەڵگورد جەلال**
**هەڵەچن: نیاز جەمال - نیاز کەمال - کەیوان عومەر**
**دیزاین: ئومێد محەمەد**
**چاپ: چاپخانەی دلێر**
**تیراژ :1000دانە**
**ساڵی چاپ: 2016**
**نرخ: 3000 دینار**
**شوێنی چاپ: سلێمانی - کوردستان**
**نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن (1037)ی ساڵی 2016 ی پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا
زنجیرە (104)

# پێڕست

## پرۆژەی
## توێژینەوە جیهانییەکان بۆچی؟

توێژینەوە جیهانییەکان، زنجیرەیەك نامیلکەی تایبەتە بە رووداو، ئاڵوگۆڕ، کێشە، قەیران، پەرەسەندنە سیاسی و ئابوورییەکانی جیهان، کە ناوەندە سیاسی و ئابوورییە زەبەلاحەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە و بەردەوام لێکۆڵینەوەی ورد و زانستی و ئاکادیمییان لەسەر دەکرێت، بە مەبەستی باشتر درککردن بە رەوشی قەیرانەکان و دۆزینەوەی رێگاچارەی گونجاو بۆ چارەسەر، یان زاڵبوون بەسەریاندا.

رووداوە سیاسییەکان و ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان، پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ لە هەر کوچەو سوچێکی ئەم جیهانەدا، کاریگەرییان لەسەر کۆی سیستمە سیاسییە لۆکاڵ، یان گڵۆباڵەکان دروستکردووە. جا هەندێك لەوانە سروشتی یان خۆرسکن هەندێکیشیان بەهۆی دەخالەتی وڵاتانی زلهێزی سیاسی و ئابووری و سەربازییەوە روودەدەن (لە بابەتی پیلانگێڕی و کودەتای سەربازی و دەخالەتی ئابووری و سەرمایەداری) یان بە ئارمان و ئامانجی سیاسی جۆراوجۆر. لە ماوەی سەد ساڵی رابردوودا،

لەسەر گۆی زەوی گەواهی ئاڵوگۆڕی چاوەڕوانکراو، یان چاوەڕواننەکراو بووبن، کە هەندێکیان خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە و هەندێکیشیان بوونەتە هۆی شەڕو کوشتاری بێ ئامان و ماڵوێرانکەر، کە بە ملیۆنان مرۆڤ گیانیان لەدەستداوە.

جیهان لەسەر دەستی زلهێزەکان و کارتێلە گەورەکانی بواری سەرمایە، وزە، نـەوت، سەربازی و هەژمونی وڵاتانی خۆرئاوای سەرمایەداری، ئەوانە و هەژاری و نەداری و سیستمی تۆتالیتار و میلیتاریستی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ئاسیا و ئەفەریقا و وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئەوروپای کۆن و بەشێك لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتین، پڕە لە جینایەت و کردەوەی دڕندانەی سەرکوت و داپڵۆسین و لەسێدارەدان و کودەتای سەربازی و برسیکردن و هەژارتربوونی هەژارەکان و سیستمی زاڵی دیکتاتۆرییەت و ژیانی مەمرەو مەژی.

پاشماوەکانی جەنگی ســاردی نێوان بلۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیستی هێشتا ئاسەواری بەسەر جیهاندا ماوەو تادێت وڵاتانی جیهان زۆرترو زیاتر خۆیان پڕ چەك دەکەن و لەهەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی و ئەتۆمی زیاتردان و کۆمپانیاکانی چەك فرۆشتن رۆژانە مۆدێلی نوێ و تازەتری چەك و فرۆکە و کەشتیگەلی مەترسیدارو گرانبەها دەخەنە بازاڕی ململانێکانەوە.

لەسەر ئاستی جیهان فایلی گەرم و گوڕو پڕ کێشە و قەیران بـەردەوام روودەدەن و دووبارە دەبنەوە، لە بابەتی شەڕی نیمچە کیشوەری هندستان و پاکستان، کێشە و ململانێی نێوان سریلانکا و پڵنگەکانی تامیل، کێشەو هەژاری لە بەنگلادیش، شەڕی گروپە ئیسلامییە رادیکاڵەکانی ئەفغانستان، کشمیری پڕ لە پشێویی، هەروەها قەیرانەکانی نێوان هندو پاکستان و چین درێژەی هەیە.

لە ئاسیا، ئەفەریقا شەڕو کوشتاری هێزە شیعی و سوننیەکان لە عێراق، یەمەن، سوریا، ئەفغانستان و لوبنان تادێت ژمارەی کوژراو قوربانییەکان روو لە زیادبوون دەکات. لەسەر دەستی گروپە ئیسلامییە

رادیکاڵ و فەندەمێنتاڵەکان، کە لەلایەن عەرەبستانی سعودیە، قەتەر، تورکیا و کۆماری ئیسلامی ئێران هاوکاری و باربوو دەکرێن و بەرییانداوەتە گیانی یەکترو هەر ئەم گروپە ئیسلامییانەن بوونەتە مایەی شەڕو کوشتار و جەنگێکی ماڵوێرانکەر لە عێراق، ئەفغانستان و سۆماڵ و فەلەستین و مالی نەیجیریا و تادەگاتە رادەی ئاستی مەترسی تیرۆر و کوشتار لە پاریس، واشنتۆن، رۆما، لەندەن و مەدرید.

هێشتا فرۆکەکانی وڵاتانی زلهێزو ژێردەریایی و کەشتیگەل و بنکە سەربازییەکانیان لەمسەر بۆ ئەوسەری جیهان دەفڕن و لەئاوە نێودەوڵەتییەکان دەسوڕێنەوە باشتر دادەمەزرێن و هەڕەشەی زۆرترو زیاتر لە جیهان دەکەن و بەردەوام دوکەڵی بۆمبەکانیان بەسەر ئاسمانی وڵاتانی هەژارو بێ دیفاعی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست رەش دەچێتەوە.

ئەم زنجیرە نامیلکەیە، ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بەو روداوانەی کە بیەوێت یان نەیەوێت، کاریگەری لەسەر رەوشی سیاسی کوردستان جێدەهێڵن.

دەزگـای ئایدیا ئەم هەنگاوەی لەو پێناوەدایە کە خوێنەری کورد ئاشنا بکات بەو ئاڵوگۆڕە باش و خراپانە و روانگە و تێڕوانینی فراوانتر بکات، کە جیهان بە تەنها بریتی نییە لە روداوگەلێکی لۆکاڵ کە لەناوخۆمان یان لە دەوروبەرمان دەگوزەرێت. بەڵکو رووداوەکان فۆڕمی گلۆباڵیان وەرگرتووەو کاریگەرییان لەسەر هەموو جیهان داناوەو سیستەمی گلۆبالیزەیشنیش هێندەی تر ململانێکانی ئاڵۆزترو توندتر کردووە.

بەو ئومێدەی ئەم زنجیرە نامیلکەیەی دەزگا ئایدیا هەوڵێك بێت بۆ دانانی کاریگەری باشتر و تێگەیشتن لەو روداوانـەی لە جیهاندا دەگوزەرێن.

**پرۆژەی تـوێـژیـنـەوەی جـیـهـانـی**
**دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە**

## پێشەکی

جەنگ، وەك هەر دیاردەیەکی تری کۆمەڵایەتی، رامیاری، ئابوری، کەلتوری پێویستی بە لێکۆڵینەوە، توێژینەوە، شیکردنەوەی زانستیانە و بابەتیانە هەیە، چونکە هەریەك لەو دیاردانە، بە پێی تێپەڕینی رۆژگار و سەردەمە جیاوازەکان، بەشێك لە خەسڵەت و تایبەتمەندی و کاریگەریەکانیان، گۆڕانیان بەسەردا دێت. زۆرجار رادەی ئەوگۆرانکارییانە دەگاتە ئاستێکی دژ و ناکۆك لەگەڵ رابردوی خۆیدا، ئەگەرچی هەندێك خەسڵەت و بنەمای هەیشەیی و بەردەوام و ستانداردیان هەیە، کە هیچ کاتێك قابیلی گۆڕان نین.

جەنگ و جەنگناسی، پێویستی بەشیکردنەوە و توێژینەوەی زۆرە، چونکە جەنگ تائێستا تەمەندرێژترین نەریت و دیاردەیە و کردەوەیەکە، لە سەرەتاییترین کاتی بوونی مرۆڤدا جەنگیش ئامادەیی هەبووە و هاوکات کاریگەری خۆشی دروستکردووە، گەر نمونەی (قابیلو هابیل) وەربگرین، لە لە مێژینەیی جەنگ دڵنیادەبین، بەوەی دوانەی قوربانیو جەلاد لەوکاتەوە دەبێتە ناسنامەیەکی ئاشنا بە ناسنامەی مرۆڤایەتی و مرۆڤ بوون.

لە دیدێکی ترەوە قوربانییە بێشومار و بێئەندازەکانی جەنگ، کارێکی ئەوتۆیان کردووە، بۆ هەمیشە (جەنگ)، بەشێکی ئەکتیڤ بێت لە نەریت و کەلتور و مێژوو و ئایدۆلۆژیاکاندا، بە ئێستاشەوە.

کەمنین ژمارەی ئەو جەنگانەی هۆکاربوون بۆ لەناوبردنی بە کۆمەڵی مرۆڤایەتی و سڕینەوەی شوێنەوار و وێرانکردنی ئاوەدانی و شارستانییە دێرین و هاوچەرخەکان.

هەندێکجار وارێکدەکەوێت، جەنگ جیاواز لە ئەرك و رۆڵە ناشرین و نامرۆڤانەکەی دەبێتە هۆکار و میکانیزم بۆ رزگارکردنی میللەتێك، یاخود کۆمەڵە کەسانێکی زۆر لە مەینەتی و زوڵم و زۆر و ژێردەستەیی دیکتاتۆری و سیستمە تۆتالیتارەکان، بۆ نمونە جەنگی دووەمی کەنداو، کە بە جەنگی رزگارکردنی کوەیتیش ناودەبرێت، ئامانجی رزگارکردن و ئازادکردنی وڵاتی

کوەیت بوو لە دەست سوپای عێراق، کاتێك بە زەبری هێز و بێ هیچ بنەما و پێوەر و یاسایەکی نێودەوڵەتی، ئەو وڵاتەیان داگیر کردبوو.

لەم سـەردەمـەدا، جەنگ چەندین شێواز و جۆری لەیەکتر جیاواز لەخۆدەگرێت، کە بە پێی هۆکارەکانی بەرپابونی، زەمینە و رادە و ئاستی بەرەنگاربونەوەی لایەنی بەرامبەر، جۆری پیادەکردنی جەنگ دیاریدەکرێت. بەم پێیە کاریگەری و دەرئەنجامەکانی جەنگ جۆراوجۆر لە رووی شێواز و ئاستەوە، دەبێتە شتێکی دروست و ئاسایی.

جەنگی دووەمی کەنداو، کە بە داگیرکردنی سەربازیانەی کوەیت لەلایەن عێراقەوە دەستی پێکرد و گەیشتە تووندترین ئاست، درێژکراوەی مێژوویەك بوو، لە ناکۆکی، ململانێ، نەگونجانی رامیاری، سنوری، ئابوری و جیۆپۆلەتیکی لە نێوان عێراق و کوەیتدا، سەرەتای ئەو ناکۆکیەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبونی وڵاتی کوەیت پاش ئەوەی لەژێردەستی بەریتانیا رزگاری بوو.

بەشێوەیەکی گشتی، ئەم توێژینەوەیە بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا دابەشکراوە، بەشی یەکەم، لە دووتوێی چوارباسدا، ئاماژە بە ناساندن و پێناسەی جۆراوجۆر و زانستیانەی جەنگ دراوە لە دیدگای ئایدیا و تێگەیشتنە جیاوازەکانەوە، وەك چۆن باس لە هۆکارەکانی بەرپابونی جەنگ بەشێکی ترە لە باسەکانی ئەم بەشە، بە مەبەستی دیاریکردنی دەرەنجامەکانی جەنگ لەم توێژینەوەیەدا، بە گەڕانەوە بۆ هۆکار و تایبەتمەندییەکان، چەند باسێك تەرخانکراوە.

بەشی دووەم و سێیەم پێکەوە تەرخانکراون بۆ توێژینەوە لە سەرەتاکانی ناکۆکی و هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی کەنداو، کاردانەوە و دەرئەنجامەکانی جەنگەکە لەسەر عێراق و کوەیت و ناوچەکە و جیهان بە گشتی.

ئامانجی هەرتوێژینەوەیەك گەیشتنە بە چەند ئاکام و دەرئەنجامێك، بۆیە لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا، ئەودەرەنجامانە دیاریکراوون کە پێی گەیشتووین.

## بەشی یەکەم- جەنگ: (مانا- هۆکار- جۆرەکانی)

باسی یەکەم - جەنگ چییە ؟
باسی دووەم - هۆکارەکانی دروستبوونی جەنگ
باسی سێیەم - جۆرەکانی جەنگ
باسی  چوارەم - ئاکامەکانی جەنگ

**باسی یەکەم - چەمك و پێناسەی جەنگ**

دوای جێگیربوونی مرۆڤ لەسەر زەوی، پاشان دروستکردنی کێڵگە، گوند و شوێنی نیشتەجێبوون و گرووپی راوکردن، ململانێ و کێبەرکێ لەنێوان مرۆڤەکان پەیدابووە و دواجار جەنگ سەری هەڵداوە.

مانا، فۆڕم، شێواز، هۆکار، ئەنجام و کاریگەرییەکانی جەنگ بەدرێژایی مێژوو گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا کۆنەکراوەتەوە، لەم سەردەمەی ئێستادا جەنگاوەرە دێرینەکان خەڵاتدەکرێن، لاوەکان سازدەکرێن بۆ ئەوەی لەدوارۆژدا جەنگاوەرێکی باش بن و بتوانن لە ئێستاوە لەسەر تەکنیك و هونەرەکانی جەنگ رابهێنرێن و ئامادە بکرێن. لەسەرەتای مرۆڤایەتیدا جەنگ روبەڕوبونەوە بووە لەگەڵ ئاژەڵ و بونەوەرە دڕندە و کێوییەکان، پاشان جەنگ لەگەڵ سروشت و دواتریش جەنگ لەگەڵ رەگەزی مرۆڤ و خودی مرۆڤ خۆیدا.

ناکرێت جەنگ لە مێژوویەکی دیاریکراودا ببینین، لەمبارەیەوە (گاستۆن بۆتۆل)، باسی چەند نمونەیەك دەکات و نوسیویەتی: «(وال هالا) پەرستگەی خوایانی ئەڵمانیا، باشترین نمونەیە، چونکە وێنەکانی ئەو پەرستگایە، ئەو جەنگاوەرانە دەنوێنێت کە پاش شەڕێکی سەرکەوتووانە ئاهەنگییان دەگێڕا، ئەم بەختەوەرانە لەژێر تیشکی روانینی وردبینی ئۆدینی خوای شەڕدا، کە دەوری بە دەستکەوت، کۆیلە و دیل تەنراوە، لەکاسە سەری دوژمندا شەراب دەخۆنەوە، لەنێو خۆیان دابەشی دەکەن و ئەوپەڕی چێژ لەکاتی خواردنی دیسیر لە کۆشکی خواکاندا دەبینن»(1).

هەر لەم بارەیەوە دەڵێت: «ئەگەر ئەفسانەکانی چین ئاشتیخوازانەن و ئایینی بودا دژی شەڕە، ئەوا ئایینی برەهمایی گەلێ شەڕخوازە. کتێبە پیرۆزە برەهماییەکان سەرجەم چیرۆکی ململانێی خواکان، سەروەری چەشنەکان، پەری و دێوەکانە، ئەو ململانێیە

هەندێکجار مرۆڤ و مەیمون و ئاژەڵەکانی دیکە تێیدا بەشدارن، پڕاوپڕە لەم چیرۆکانە، بەشێکی زۆری هۆنراوەی حەماسی (رامایانا) (*)، بۆ گێڕانەوەی ئەم روداوە ئەفسانەییانە تەرخانکراون و لێوان لێوە لە وەسفی ئەم جەنگانە، پەرستگە هندیەکان بەو بەردهەڵکەنانە ئاخنراوە کە ئەوململانێیانەی تێدا هەڵکەندراوە و هەندێك خوای وەك: «(ئیندرا)(**)، (میترا)(***)، (وارۆنا)(****)، (برەهما)(*****)، (ویشنۆ)(******)، خوا گچکەی (کـالـی)(*******) بە گالیسکەی جەنگییەوە پێکەوە خەریکی شەڕن.

لە ئەفسانەکانی یۆناندا (زیۆس)(*)و هەندێك خوای جەنگاوەری وەك (تیتان)ەکان(**)، دێوەکان و (تیفە)(***) خەریکی جەنگن (کرۆفووس)(****) لەگەڵ (ئەفیونە)(*****) شەڕدەکات، چواردەوری (مـارس)(******) بە دووڕوییو ترس و تۆقین تەنراوە، ئەو شانازی بەنازناوی (مرۆڤکوژ)ەوە(*******) دەکات»(2). هەروەها دەڵێت: «بەر لەدەستپێکردنی شەڕیساڵی (1940) لە ژاپۆن، فڕۆکەوانانی خۆبەختکاری گەنج، شەوی بەر لەبەڕێوەبردنی راسپاردەی بەختکارانە، بەشداری بۆنەی شیوەنیان دەکرد. ئەوان بەرگی سپی، واتە بەرگی شیوەنیان لەبەردەکرد، بەم چەشنە بەشێوەیەکی هێمن، خۆیان لە هەموو ویستیکی دنیایی پاکژ دەکرد»(3).

لەسەردەمێکی دیاریکراودا جەنگ وەك چەمکێك لەلایەن زانایانەوە ناسێنراوە و توێژینەوەی لەسەرکراوە. لە وڵاتانی دەرەوەی کوردستاندا چەندین ناوەند و سەنتەری تایبەت بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەسەر جەنگ، کاریگەرییەکانی، هۆکارەکانیو جۆرەکانی جەنگ هەیە، کە ساڵانە و مانگانە راپۆرت و توێژینەوەکانیان بڵاودەکەنەوە و نوێترین زانیاری لەسەر جەنگ و لایەنە پەیوەندیدارەکانی بڵاودەکەنەوە، زۆربەی ئەو سەرچاوانە بە زمانی بیانی و زیاتر بە زمانی ئینگلیزین، بە دەگمەن وەرگێردراون بۆ زمانی کـوردی، بەڵام ئەوەندە هەیە

له سەرەتاکانی مرۆڤایەتییەوە جەنگ ئامادەیی هەبووە و بەهۆکار و ئامرازی جیاجیا جەنگ پراکتیزەکراوە و کاریگەری خۆی هەبووە، زۆرجاریش وەك هەندێك لەبەڵگەنامە و فیلمە دۆکۆمێنتارییەکان ئاماژەی بۆدەکەن، جەنگ لەوسەردەمە کۆنانەدا لە ئاکامی لێکنەگەیشتن و هەستکردن بە مەترسی و خۆپاراستن بووە.

جەنگ بە مانایماڵوێرانی و نائارامی ئاسایش و شڵەژانی بواری ئابوری و پچڕانی شیرازە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و شکاندنی بەها مرۆڤایەتی و پیرۆزەکان دێت، ئەمە لە ناساندنێکی گشتگیر و باوی چەمکی (جەنگ)دا، بەڵام لە رووی زانستی و تیۆرییەوە چەندین بۆچوون و بیروڕای جیاواز لەسەر جەنگ هەیە، بۆ نمونە:

(کلاوزەڤتز) پێیوایە: «جەنگ هیچ نییە جگە لە درێژەپێدانی سیاسەت بە جۆرێکیتر، یان وردتر لەوەش، درێژەپێدانی ئاسایی سیاسەتە بە هاوبەشی هۆکارێکیتر»(4). بەم مانایە جەنگ خۆی بریتییە لە پراکتیزەکردنی سیاسەت لە شێواز، فۆڕمی جیاوازدا و لێرەدا سیاسەت ئەرکێك وەردەگرێت جیاوازترە لە ئەرکەکانی تری، کە (خۆپیشاندان، هەڵبژاردن، چونە نێوپەرلەمانو وەرگرتنی دەسەڵات، یاخود بەشداریکردن لەپارتە سیاسییەکان و بوونە گرووپی فشار لەسەر دەسەڵات)ە. بە پێی بۆچوونەکانی (کلاوزەڤتز)، جەنگ و بەکارهێنانی سەربازی دەبێتە هۆکارێکی تر و رێگەیەکی تری جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنی سیاسەت، جگە لە ئەرکە ئاساییەکانی سیاسەت کە بریتییە لە ململانێی پارتە سیاسییە رکابەرەکان لەپێناو دەسەڵاتدا، پیادەکردنی شێواز و فۆڕمی جیاواز لە ئاڕاستەکردنی سیاسەتی کۆمەڵگەدا، بەکاربردنی ئایدۆلۆژیا بەسود و قازانج و ئامانجی گروپێکی دیاریکراو. هەڵبەت ئەمەش دەبێتە هۆکاری دروستبونی تووندو تیژی و بێ متمایی و رێگەخۆشکردن بۆ بەرپابونی جەنگ.

(شازادە موریس ساکسونی)، جەنەراڵی مەزنی سەدەی هەژدەیەم

ئاماژە دەکات «هەموو زانستێك بنەما و یاسای خۆی هەیە، تەنها جەنگ هیچ یەك لەم دوانەی تێدا نییە». بەم پێیە جەنگ بریتییە لە کردارێك یاخود زانستێکی بێ بنەما و یاسا، بە واتای ئەوەی لەمیانەی بەڕێوەچونی جەنگدا هیچ بنەمایەك نییە تا جەنگاوەران لەسەری بڕۆن و پابەندبن پێوەی، وەك چۆن هیچ یاسایەك نییە جەنگەکە بەڕێوەبەرێت و لادان لەو یاسایە بە سزادان بکەوێتەوە و مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، یاخود بە یاسا جەنگ بەرپابکرێت و هەر یاساش کۆتایی بە جەنگ بهێنێت، دەشێت بڵێین رەنگە ئەم هۆکارەبێت کە نەتوانراوە رێگە لە بەرپابوونی ئەو رێژە زۆرە لە جەنگ بگیردرێت کە لە سەرەتاکانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە تا رۆژگـاری ئەمڕۆمان بەردەوامی هەیە، لە سەرچاوەیەکی تردا ئاماژە بۆئەوەکراوە «جەنگ وەك یادگارێکی سەردەمی دڕندایەتی لە ئارادایە»(5).

ئەمەش لەگەڵ قسەکەی سەرەوەماندا پەیوەندیەکی مێژوویی بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، چونکە لەو سەردەمەدا کە بە سەردەمی دڕندایەتی دەناسێنرێت، سەرەتاکانی مێژووی مرۆڤایەتی و ژیانی بەربەریەتە، هیچ جۆرە یاسا، رێسا، لۆژیك و بنەمایەك نەبوە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی رۆژانەیان، لەبەرئەوە زۆرجار بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکیەکانیان، جەنگیان ئەنجامداوە و هەموو شێواز و رێگەیەکیان بەکارهێناوە، بۆیە هەندێك کەس جەنگ وەك کاری دڕندەکان تەماشا دەکەن، چونکە ئەوەی جەنگ بەرهەمی دەهێنێت، کۆتایی هێنانە بە ژیانی مرۆڤ و ماڵوێرانیو تێکدانی شیرازەی ژیانی مرۆڤایەتی.

(فۆن بلو)، پێیوایە: «ستراتیژێکی زیرەکانە، پێویستی لێهاتوویی تاکتیکی کەمدەکاتەوە و بە جارێك کۆتایی بە جەنگ دەهێنێت»(6). واتا گەر بتوانرێت لە ململانێی سیاسی و لایەنە دژ و رکابەرەکاندا ستراتیژێکی واقیعیانە و لۆژیکیانە بۆ کارایی و مامەڵەکردنی بەرامبەر

دروستبکرێت، ئەو کات زۆر بە زەحمەت ئەگەر و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی جەنگ درووست دەبن.

وردتر بڵێین، گەر عەقڵ و لۆژیك توانی حوکمڕانی دامەزراوەکانی بڕیاردان بکات، ئەوا جەنگ بەرپا نابێت، لەبەرامبەردا (کلاوزەڤتز) دەنوسێت: «ستراتیژی بێ جەنگ و جەنگکردن، واتـای هیچ دەبەخشێت، چونکە جەنگ ئامڕازی کاری ستراتیژە و هۆکارێکە سودی لێوەردەگیرێت»(7)، بە پێچەوانەی (فۆن بلو)، جەنگ ئەنجامی ستراتیژە و هۆکاری جێبەجێکردنی ئەو ستراتیژەیە کە لایەنێکی دیاریکراو ئاڕاستەی دەکات و جەنگ وەك هۆکارێك بۆ ئەو ستراتیژە بەکاردەهێنرێت.

(بیار کلاستر) سەبارەت بە جەنگ ئاماژە بەوەدەکات «زۆرجار جەنگ لەکۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا بۆ پارێزگاری بـارودۆخ و بەرگریکردنی گۆڕانکاری بێت»(8)، ئەم پێناسەیە دەمانباتەوە بۆ ژیانی سەرەتایی مرۆڤ، کە هەمیشە لەگۆڕانکاری ترساوە، جەنگ وەك هۆکارێك بۆهێشتنەوەی ئەو گۆڕانکاریانە بەکارهاتووە، تا ئەم سەردەمەش جەنگ ئەم واتاو ئەرکە دێرینەی لەدەست نەداوە، چونکە دەبینین ئێستا جەنگ بۆ خۆپاراستن لە ئەگەری هەرگۆڕانکارییەك بەکاردێت کە ڕەنگە بەرامبەر بەسەریدا زاڵبکات، «جەنگ کە سیاسەتی دەرەوەی کۆمەڵی سەرەتاییە، پەیوەستە بە سیاسەتی ناوخۆ و دەتوانرێت ناوی بنێین سیاسەتی پارێزگاری»(9). لەم تێکستەوە جەنگ ئەو چارەسەرەیە کە کۆمەڵگە داخراو و سەرەتاییەکان بە مەبەستی خۆپاراستن لەگۆڕانکاری و عەقڵیەتی دەرەوەی خۆیان پراکتیزەی دەکەن، واتا لەبری زمانی دیالۆگ، لێکگەیشتن و قبوڵکردنی جیاوازییەکان، پەنا بۆ تەکنیك و سیحری جەنگ دەبـرێـت و هەوڵدەدرێت جگە لە بەرگریکردنی بۆچون و پێشینەکان، هاوکات لە جەنگدا خۆیان بەسەر بەرامبەردا دەسەپێنن.

(کلاوزەڤتز) دەڵێت: «جەنگ بەدەر لە پەیمانە دەستوپێگیرەکان بوو، ئەم پەیمانانەی لە تورەیی خۆیدا نابود دەکرد، ئەمە لە راستیدا قــەرزداری بەشداریکردنی نوێی خەڵك لەمجۆرە کارە مەزنانەی حکومەتدا بوو، هاوبەشی ئەمان لە سەرێکەوە لەو کاریگەریەوە سەرچاوەی گرتبوو کە شۆڕش لەسەر هەلومەرجی ناوخۆیی هەموو دەوڵەتێك بەجێی دەهێشت و لەسەرێکی ترەوە لەبەر ئەو مەترسیە بوو کە فەرەنسا لەسەر هەریەکە لەمانە دروستی کردبوو»(10). بەم پێیە جەنگ دژ بە پەیمان، رێسا و نەریتە باوەکانی کۆمەڵگەیە، ئەوانەی بەشداری لەوجەنگانەدا دەکــەن، لە ژێر کاریگەری و دەرئەنجامی ئەو هەست و سۆزەدان کە شۆڕش لەسەر کۆمەڵگەکانیان دروستیدەکات، چونکە سەرەتاکانی شۆڕش زیاتر بە هەڵچون و سۆزگەرایی دەستپێدەکات، ئەمەش لەوەدا کورت دەبێتەوە گەر بە عەقڵ مامەڵەی جەنگ بکرێت، ئەوا زوو جەنگ شکست دەهێنێت، چونکە هیچ کەسێك ئامادە نییە خۆی بریار لەسەر مەرگی خۆی و کاولکاری ماڵەکەی بدات، لەجەنگدا هەموو شتێك هێجگار سانایە، بەڵام ساناترین شت هێجگار نادیارە... وردە وردە رووداوی بێشومار ئەوانەی کە هەرگیز بە دروستی ناتوانی پێشبینیان بکەیت، ئاوێتەی یەکتری دەبن، ئەمە بە واتای ئەوەی هەر کردەیەك کە مرۆڤ بیەوێت زۆر بە سانایی دەتوانێت ئەنجامی بدات، چونکە وەك لەسەرەتادا باسمانکرد، هیچ بنەما و یاسایەك نییە کە جەنگ و جەنگاوەران پێی پابەندبن، بۆیە هەموو کار و کردەوەیەك لە جەنگدا رەوایە.

بێگومان جەنگ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، دەکرێت بڵێین جەنگ ئافرێنەری مێژووە، چونکە  مێژوو تەنیا بە گێڕانەوەی ململانێیەکی چەکدارانە دەستیپێکردووە و ئەستەمە هیچکات ئەم دیاردەیە بە تەواوی لەناوبچێت، لەهەمانکاتدا، ئەو سنورانەن کە چەندین قۆناغی گرنگی  روداوەکان لەیەکتر جیادەکەنەوە، بە رادەیەك سەرجەم ژیارە

ناسراوەکان بە هۆی جەنگ تێداچوون ، وەك چۆن هەموو ژیارێکی نوێش بە جەنگێك هاتونەتەدی، ئەو سەروەریانەی کۆمەڵگایەکی تایبەت دەکەنە گەورەی کۆمەڵگەی مرۆیی، زادەی جەنگن و رەوایەتی خۆیان لە جەنگ و بە جەنگ وەرگرتووە.

جەنگ لە هەمانکاتدا وادەکات کۆمەڵگا داخراوەکان دەرگاکانی خۆیان ئـاوەڵا بکەن و دەتوانین بڵێین که جەنگ بەهێزترین و کاریگەرترین شێوەی بەریەککەوتنی ژیارە جیاوازەکانە.

بە بۆچونی (کلاوزویتس): «جەنگ شتێکە لە زەبروزەنگ بۆئەوەی لایەنی دژ ناچاری جێبەجێکردنی داوا و مەرجەکانی ئێمە بکات»(11). بەم پێیە جەنگ ئامرازی کوشتن و لەناوبردنی جیاوازییەکانە و خاوەنی خەسڵەتێکە کە لەگەڵ دیالۆگ و راگۆرینەوەدا ناتەبایە، جەنگ هەرتەنیا پێکدادانی چەکداری نێوان لایەنەکان نییە، بەڵکو ململانێی توندوتیژە لە نێوان ئابوری و سیاسەت و ئایدۆلۆجیای لایەنەکان. واتا مەرج نییە جەنگ تەنها زمانی توندوتیژی و چەکداری بێت، بەڵکو زۆرجاریش پێکەوە هەڵنەکردنی رەهەندە ئابوریی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژیەکانە کە بەریەکتری دەکەون، کێشە و هەرای گەورەی لێدەکەوێتەوە، دواجار بە جەنگ کۆتایی دێت.

لە ئەمڕۆدا جەنگ بەبێ گوێدانە ئاڕاستە و شێوازی بیرکردنەوە و پابەندییەکانی، خۆی بەسەر هەر کەسێکدا دەسەپێنێت، بۆیە دەبێت هەموو کەسێك وەها لە جەنگ بڕوانێت و مامەڵەی لەگەڵدا بکات کە پەیوەندیدارە بە جەنگ.

جەنگ تەنیا پێکدادانی چەکداری نێوان لایەنەکان نییە، بەڵکو ململانێی توندوتیژە لەنێوان ئابوری، سیاسەت و ئایدۆلۆجیای لایەنەکان، هەروەها بریتییە لە بەکارهێنانی زمانی چەك و توندوتیژی لەجیاتی زمانی عەقڵ، دیالۆگ و ڕاگۆڕینەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفت و نائارامیەکان.

فەلسەفەی چینی تاکە فەلسەفەیە بە درێژایی سەدەکان، باسی جەنگی نەکردووە، کۆنفۆشیوس پێیوایە: «ژەنەراڵێکی راستەقینە، حەزی لە شەڕ نییە، رقاویی نییە و بە هەستیش کارناکات»(12)، بە واتای ئەوەی سەرکردە و فەرماندەی گەورە و راستەقینە بێ ئەوەی پەنا بۆ جەنگ ببەن و بەبێ زەبروزەنگ و توندوتیژی دەگەنە پلە و دەسەڵات، هەروەها دووربوون لە بەکارهێنانی سۆز و پاڕانەوە، بەڵکو لەوپەڕی هۆشیاری و توانای ژیری و لۆژیکی خۆیاندان.

هاوکات «لە فەلسەفەی یۆناندا تێگەیشتنێکی تـازەی پرسی جەنگ بەرچاو ناکەوێت، یۆنانیەکان بەگشتی جەنگیان بە بەشێك لەخواستی خوداوەندی دەزانـی، بەڕای (هیراکلیتوس)(*)، جەنگ کەرەستەی خواستی خوداوەندییە، چونکە جەنگ مرۆڤ و خواکان خانەبەندی دەکات، جەنگ دایکی هەموو شتەکانە، هەندێکەس دەباتە پلەی خوایەتی و هەندێکەس کۆیلە و هەندێکی دیکە ئازاد و سەربەست دەکات، ئەفلاتون و ئەرستۆ بەسەر جەنگدا هەڵنادەن و سەرکۆنەی دەکەن ، بەڵام جەنگ بۆ پاراستنی (دەوڵەتەشار)(**) بە رەوا دەزانن»(13).

دەکرێت بڵێین وەك زۆرێك لە دیاردە سروشتیەکانی تر لە فەلسەفەی دێرینی یۆنانیدا، جەنگ بۆتە خوداوەندێك و توانای گۆڕینی پێگەی کەسەکانی هەیە، گەر راڤەیەکی وردی بۆ بکرێت ئەم لێکدانەوەیە راستە، چونکە لە ئاکامی هەرجەنگێکدا لایەنێك دەدۆڕێت و دەچێتە نزمترین ئاستی ژیانەوە، لەبەرامبەردا لایەنی براوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دەبێتە خاوەنی بڕیار و سەرچاوەکانی ژیان.

هاوکات جەنگ لای (هیگڵ): «حەقیقەتێکی ناپەسەندە کە بەهۆی بەدیهاتنی رۆحی رەهاوە کۆتایی دێت»(14). جەنگ راستییە، یاخود دیاردەیەکی واقیعیە، بەڵام ئەو راستیە رەتدەکاتەوە، چونکە بە گەیشتن بە ترۆپکی باڵایەتی لە بڕیاردان و لوتکەی هەڕەمی دەسەڵات

و بوون بە (منی باڵا)، ئەو جەنگە و ئەو راستییە کۆتایی پێدێت و کاریگەری نامێنێت.

نوسەرو فەیلەسوفی فەرەنسی (ژۆزیف دۆمەیستەر1753-1821)، سەبارەت بە جەنگ دەڵێت: «جەنگ لەخۆیدا مەلەکوتییە، چونکە جەنگ یاسای خیلقەتە. مرۆڤ لەهیچ کوێدا بە قەد پانتایی جەنگ، هەست بەدەستی خواوەندیی ناکات»(15). ئەمەش تێگەیشتن و ناساندنێکی میتافیزیکییە و پێیوایە مرۆڤ لە جەنگدا تەنها خوداوەند دەیپارێزێت، چونکە خودا لەسەرەوەی هەموو ئیرادەکانی سەر زەوی و مرۆڤەوەیە.

(ئۆگست کۆنت)، باس لە جەنگ دەکات کە «جەنگ کۆیلایەتی ساناکردەوە و بەم کارەش پیشەسازیی بەدیهێنا»(16). کۆنت جەنگ بەهۆکاری کۆیلەکردن و دەستەوەستانی مرۆڤ دەناسێنێت، بەهۆی کۆیلەبوونی مرۆڤیشەوە و کڕینی لەلایەن خاوەن سەرمایە و کارگە گەورەکانەوە، چەندەها کارگەی گەورە دروستبوون و بە جەستە و ماندووبونی مرۆڤە کۆیلەکان بەرهەمەکانی کارگە پیشەسازییەکان زیاتر بووە، چونکە کۆیلەکان ئەو جەنگاوەرانەبوون لە بەرەکانی جەنگدا بەدیل دەگیران و وەك کۆیلە کڕین و فرۆشتنیان پێوەدەکرا.

(هێربێرت سپنسەر)، سەبارەت بە جەنگ نوسیویەتی: «مادام بەربەریەت و ژیاری سەرەتاییانە هەیە، ئەرکی جەنگ؛ لەناوبردنی کۆمەڵگەی لاوازو لابردنی ناتواناکانە لەکۆمەڵگە بەهێزەکاندا»(17).

تێگەیشتنی (سپنسەر) بۆ جەنگ درێژەپێدانی کەلتور و ژیاری و نەریتی ژیانی بەربەریەت و کۆمەڵگە سەرەتاییەکانە، جەختکردنەوەیەتی لەسەر ئەوەی جەنگ لەو کۆمەڵگەیانەدا سڕینەوەی بەرامبەر و کۆتاییهێنان بووە بە کۆمەڵگە و گرووپە لاواز و بێهێزەکان لەلایەن کۆمەڵگە و گرووپە سەردار و بەهێزەکانەوە.

بە بۆچونی کۆمەڵناسی فەرەنسی (گابریل دی تارد)(*): «جەنگ

میتۆدێکی کارەسات ئامێز و نائەبەدی دیالێکتیکی کۆمەڵایەتییە»، واتا جەنگ بەرنامەیەکە بۆ سەرهەڵدان و دروستکردنی کارەسات و ئاژاوەیەکی کۆتایی پێنەهاتووی ناوکۆمەڵگە و ژیارە جیاوازەکان، لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێت: «بـەڵام جەنگ لەخۆدا هیچ شتێك بەدیناهێنێت، هیچ جەنگێکی گەورە نەبۆتە هۆی پێشکەوتنی بنەبڕ لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا»(18). کەواتە جەنگ بەبێ بەشداری خودی مرۆڤەکان ناتوانێت هیچ گۆڕانکارییەك لە کۆمەڵگەدا و لەبەرامبەر نەریتە باوەکان دروستبکات، وەك چۆن تا ئێستا هیچ جەنگێك نەیتوانیوە سیستمێکی دیاریکراو بگۆڕێت و لەناوی بەرێت، هەڵبەت مەبەستی زیاتر لەوەیە بڵێت ئەو سیستمانەی جەنگیان بەسەردا سەپێنراوە، یاخود بەرامبەری بەرپاکراوە، نەتوانراوە لەرەگ و ریشەوە دەربهێنرێن و بسڕدرێنەوە، چونکە لەهەر دۆخێکدا بێت یان جەنگەکە چەند فراوان و گشتگیر بێت، هێشتا ناتوانێت پەی بە هەموو کەلەبەر و شوێنە هەستیار و نهێنییەکانی بەرامبەر بەرێت.

بـەم پێیە دەگەینە ئـەوەی جەنگ دوالیزمەیەکە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا و لێکجودابونەوەیان مەحاڵ و ئەستەمە، هەڵبەت بە سەرنجدان لە روداو و جەنگەکان (ئار، ئیس، ستینمیتز) وا لێدەکات مرۆڤ و جەنگ پەیوەست بکات بە یەکەوە و بانگەواز دەکات کە جەنگ نابێت کۆتایی پێبهێنرێت، چونکە دەشێت بە کۆتایی هاتنی جەنگ یان مرۆڤ تووشی نامۆبون و تەنهایی بێت یاخود چەندین کارەسات و روداو بە هۆی کۆتایی هاتنی جەنگەوە لە جیهاندا بەرپابێت.

(ئیزۆلە) سەبارەت بە جەنگ دەڵێت: «جەنگ بە پێویست شتێکی ئەخلاقییە»، لێرەوە ئەو هاوکێشەیە هاوسەنگ دەکات کە هێز و فەزیلەت دوولای یەك هاوکێشەن و هاوواتای یەکترن، بێهێزەکان و لاوازەکان، واتە ئەو کەسانەی بە دڕەوشتن و بە جەنگ لە سەرانسەری

جیهاندا دەسڕێنەوە و کۆتاییان پێدەهێنرێت، هەربۆیە هۆکارێکی وەك کـردەی بەرامبەر و یەکگرتن، دەبێتەهۆی وەرچەرخانی بنەڕەتەکان و گەشەی وشیاریی کۆمەڵایەتی، زانستی، پیشەسازیی و ئەخلاقی مـرۆڤ. هەروەها (م.کونسی رایـت) لای وایە جەنگ ئەو مەرجە یاساییەیە رێگە بە دوو یان چەند گروپی دژکار دەدات، تاکو ململانێیەك بە هێزی چەکداریی بەڕێوەببەن، لێرەدا جەنگ دەبێتە مافێکی سیاسی و ئاسایی هەرکەسێك یاخود هەر گروپێك کە بۆیەکلاکردنەوەی ململانێو ناکۆکی و کێشەکانی لەگەڵ گرووپی دژ و بەرامبەردا، پەنا بۆبەکارهێنانی جەنگ دەبات، بەڵام کەسانێکی وەك (مارتینز) جەنگ بە «خەباتی نێوان مرۆڤ» دەناسێنێت(19). ئەم تێکستە ئەوە دەگەیەنێت کە لەمێژە مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی خواست و ئامانج و بەرژەوەندییە جیاوازەکانی خەباتدەکات، بە درێژایی مێژوو ئەو خەباتەی مرۆڤ شێواز، روخسار، تایبەتمەندی جیاواز و نوێی وەرگرتووە، کە جەنگ دەبێتە یەکێك لە روخسارەکان یان تایبەتمەندییەکانی خەباتی درێژخایەنی مرۆڤ.

سەبارەت بە هونەری جەنگ (کلاوزەڤیتز) دەڵێت: «هونەری جەنگ بریتیە لە زانینی بەکارهێنانی هۆکارە جیاوازەکان لە جەنگدا»(20)، واتا چۆنیەتی بەرەنگاربونەوەی دوژمن یاخود لایەنی بەرامبەر و بەکارهێنانی لۆژیك و عەقڵ لە هەڵبژاردنی هۆکارە جیاوازەکانی بەرەنگاری و دیاریکردنی هۆکاری کاریگەر بۆ سەر بەرامبەر، بە هونەری جەنگ دەناسرێت.

(سۆن تزۆ) دەڵێت: «جەنگ چالاکیەکی دەوڵەتە و کێشەی مان، نەمان، گەشە و وێرانبوونی گەل و نەتەوەیە، بۆیە دەبێت بە وردی و لە هەموو روویەکەوە باری سەربازی هەڵسەنگێنرێت»(21).

بەم پێودانگە جەنگ تەنها سیمایەکی سەربازیانە و میلیتارییانە وەردەگرێت و دەبێتە بەشێك لە کار و چالاکی و تایبەتمەندییەکانی

دەوڵەتی خاوەن سەروەری، واتا جەنگ دەبێتە فاکتەری بەرگریکردن لە بەرزهێشتنەوەی سەروەری نیشتمان و نەتەوە.

(لی-شوان) دەڵێت: «جەنگ کێشەیەکی گرنگە، گەر کەوتەدەست پیاوانی نەزان ئەوە کارەساتێکی مەترسیداری نەتەوەییە»، شیکردنەوەی ئەم تێکستە جگە لە جەختکردنەوە لە گرنگی و هەستیاری چەمك و بابەتێکی وەك جەنگ بەسەر تەواوی ژیانەوە، هاوکات لەومەترسیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە دەشێت لە گرتنەدەستی ئاڕاستەی جەنگ لەلایەن کەسانێکی نەزان و ناژیرەوە کارەسات و ماڵوێرانی و کاولکاریی بەرپابکەن. کەواتە لێرەدا دەکەوینە بەردەم دوو ئاڕاستەی جەنگەوە کە لەلایەن کەسانی (ژیر) و (ناژیر)ەوە بەڕێوەدەبرێت و بە دوو ئاکامی جیاواز دەگات، ئاڕاستەی یەکەم کارەساتبارە، چونکە مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە و بە گەیشتن بەوئامانجە جەنگ کۆتایی دێت، بەڵام ئاڕاستەی دووەمیان ئاڕاستەیەکی تەواو کارەساتبار و نەهامەت ئامێز و کاولکارە، چونکە مەبەستی ئەو کەسانەی سەرکردایەتی جەنگەکە دەکەن، ئامانج و مەبەستیان خولّقاندنی کاولکاری، نەهامەتی، کارەساتی گەورە، فراوان و گشتگیرترە، کە ڕەنگە تەشەنە بکات بۆجەنگێکی هەرێمی یاخود نێودەوڵەتی، هەروەك کلاوزەڤیتز ئاماژەی بۆ دەکات «جەنگ لە نێوان گەلە شارستانیەکاندا کەمتر دڕندەیی و کارەساتی لێدەکەوێتەوە»(22).

هەر سەبارەت بە جەنگ (کافین رالی) دەڵێت: «جەنگ کارێکی سروشتیە و خۆلێلادانی نییە»(23)، لێرەوە جەنگ دەکاتەوە بە یاسا، سروشتی، دەیخاتە سەر، توانستی هەستی و نەستی مرۆڤ، کەواتە هەمومان مەحکومین بە جەنگ و جەنگ بۆتە بەشێکی ئامادە لەژیان و کەلتور و بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی، بۆیە دەشێت ئەو نائارامی و ناسەقامگیری و جەنگە کاولکار و کارەسات بارەی سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە، هۆکارەکەی بۆ ئەو ئامادەییە هەمیشەییەی جەنگ لەنەستی خودی مرۆڤ خۆیدا بگەڕێتەوە.

بێگومان جەنگ کاریگەری و سێبەری خۆی لەسەر پەیوەندی و یاسا نێودەوڵەتییەکان دروستکردووە، پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان زۆرجار لەسەر بەرژەوەندی دوو وڵات کە هاوکاری یەکترییان کردووە لەبواری جەنگدا لەبەرامبەر دوژمنێکی هاوبەشدا دروستبووە، یاسا نێودەوڵەتیەکان هەوڵیانداوە بەر بەهەڵگیرسانی جەنگ بگرن و کارێك بکەن ململانێ‌و ناکۆکییەکان لە ڕێی دیپلۆماسیی و گفتوگۆوە، یان هەرهیچ نەبێت بە جەنگی سارد کۆتایی پێبهێنرێت، لەم بوارەشدا هەوڵدان بۆ داماڵینی چەك لەجیهان‌و بەرگرتن لەفراوانکردنی پرۆژە ئەتۆمیەکانی وڵاتان بەشێکە لەو هەوڵە نێودەوڵەتییەی بۆ کۆتایهێنان بە جەنگ دراوە. ناکرێت هەوڵ‌و توانا سەربازی‌و جەنگییەکان لە نەخشەی سیاسەتی دەرەوە دوور بخەینەوە(24)، هۆکاری سەربازی کاردەکاتە سەر بارودۆخی جەنگ و ئاشتی لە جیهاندا، زۆربەی وڵاتان بەشێکی زۆر لە داهات بۆجەنگ و پێداویستی و پیشەسازی سەربازی تەرخاندەکەن، ئەمەش بێگومان نادڵنیایی و نائارامیی نێودەوڵەتی لێدەکەوێتەوە، کەواتە پێویست نییە وڵاتان بەر لەهەر میکانیزمێك پەنا بۆ جەنگ بەرن بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییەکان، بەڵکو دەبێت جەنگ دواین بڕیار بێت(25).

جەنگ زۆرتـریـن نائارامی و نادڵنیایی بەخشیوەتە جیهان و کاریکردۆتە سەر پەیوەندی و یاسا نێودەوڵەتییەکان، بۆیە لەجاڕی گەردونی مافەکانی مرۆڤ و ڕێکەوتننامەی مافە سیاسی و مەدەنیەکان، لەم بوارەدا هەڵوەستەی کردووە و بە پێویست و گرنگی ئەژماری کردووە و بەندو یاساو ڕێسای تایبەتی داناوە و وڵاتانی دنیای پابەندکردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی دوربێت لە لەناوچوون، ئاشتی و ئارامی باڵ بەسەر دونیادا بکێشێت، هەندێك جەنگ هەیە لەلایەن وڵاتانی دونیاوە ڕەوایەتی پێدەدرێت و پشتیوانی و کۆمەك دەکرێت بە ناوی جەنگی ڕەواوە، بۆنمونە (جەنگ دژی تیرۆر) کە لەلایەن

ئەمەریکاوە بانگەوازی بۆکراو ئەنجامدرا، هەروەها جەنگەکانی کەنداو و جەنگی لێدانی عێراق، کە سەرباری بوونی ئەو یاساو رێسا نێودەوڵەتییانە بۆڕێگرتن لە ئەنجامدانی جەنگ، بەڵام زۆر بە ئاشکرایی بانگەوازی هاوکاریکردن و پشتیوانی لێکردن و بەشداربوونی وڵاتان دەکرێت. هەروەك دکتۆر (عمرو عبدالسمیع) سەبارەت بە جەنگ ئاماژەی بۆ دەکات «خاڵێکی ئاست بەرزە لە ململانێی ئیرادە جیاوازەکان بە ئاگر و ئاسن»(26)، واتا جەنگ دەبێتە خاڵی توند و هۆکاری یەکلاییکەرەوەی ململانێ و ناکۆکیەکان بە ئامرازی توند و داپڵۆسێنەر دوور لە زمانی دیالۆگ و لێکگەیشتن و یەکتری قبوڵکردن.

هەرچەندە «هەندێکجار خودی جەنگ دەگۆرێت بۆکەرەستە گەلێکی دژەجەنگ بۆ رێگرتن لە جەنگی گەورەتر، واتا جەنگ دەگۆڕێت بۆدژە جەنگ». بەم پێیە جەنگ بۆخۆی پرۆسەیەکە لە هەناوی خۆیدا مەرگی خودی خۆی هەڵگرتووە و دوالیزمەی مردن و ژیانی خۆیەتی.

**باسی دووهەم- هۆکارەکانی دروستبوونی جەنگ:**

لە بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیەدا ئاماژەمان بە چەندین پێناسە و ناساندنی جەنگ کرد، هەریەك لەوپێناسانە جەنگیان بۆ هۆکارگەلێکی جیاواز لەیەکتری گێڕایەوە، هەرەیەکەیان بەجۆرێك کاریگەری لەسەرچۆنیەتی هەڵگیرساندن، ئاراستەکردنو ئامانجە جیاجیاو جۆراوجۆرەکانی جەنگ هەیە، بێگومان جەنگ لەئاکامی هۆکارو کردەیەکەوە دروستدەبێت کە کاریگەرییەکەی بەجۆرێکە گفتوگۆ و ناوبژیوانی ناتوانێت چارەسەری بکات، یاخود ململانێکە گەیشتۆتە دوایین پلەی توندێتی و سەرەنجام کڵپەی ئاگری جەنگی هەڵگیرساندووە. چەندین هۆکار هەیە دەبنە مایەی هەڵگیرساندنی جەنگ.

**•هۆکاری ئابوری:**

چاوبڕینە سەرچاوە ئابوریەکان و هەوڵدان بۆ پاوانکردنی بازاڕ و بازرگانی جەنگی لێدەکەوێتەوە، (دکتۆر ئەحمەد ئەنوەر زەهران) لەم بارەیەوە دەڵێت: «کاتێك ناکۆکیو ململانێ لە نێوان دوو وڵاتدا دروستدەبێت و ئاکامەکەی دەگۆڕێت بۆ جەنگ، بە ئامانجی دەستکەوتنی کەرەستەی خاو و دابینکردنی هۆکانی گواستنەوە و بازاڕە بازرگانیەکان بەهۆی ئاوەوە»، بەم پێیە کاریگەرترین هۆکاری ئابوری جەنگ بریتییە لە دەستخستنی کەرەستە خاوەکان و سەرچاوە سروشتیەکانی پرۆژە پیشەسازی و بازرگانی و ئابوریەکان لەلایەن دەوڵەتێکەوە کە لای دەوڵەتی بەرامبەر دەرەخسێن، بەهەڵگیرساندنی جەنگ بەرامبەریو هەوڵدان بۆ داگیرکردنی سودێکی گەورە بە ئابوریو پیشەسازی وڵاتی داگیرکەر سەرهەڵدەدات. لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا نوسیویەتی: «بە تێپەڕینی سەردەمی ئیمپراتۆرەکان و سەقامگیربوونی پەیوەندی نێودەوڵەتی لە سەر بنەمای یەکسانی و پێکەوەژیانی ئاشتیانە لەنێوگەلاندا، چەندین مەترسی نوێ سەریانهەڵدا و هەڕەشەیان لە ئاشتی جیهانی دەکرد، ئەویش لە ئاکامی دروستبونی بۆشایی و جیاوازی گەشەسەندنی گەورەی ئابوری لە وڵاتانی پێشکەوتوی جیهان لە بەشی سەروی گۆی زەویدا لەگەڵ وڵاتانی دواکەوتوی جیهان لەباشوری گۆی زەویدا»(27).

ئەو جیاوازییە گەورە و بێئەندازەیەی لەبوارەکانی پیشەسازیو تەکنەلۆژیاو کارگە گەورەکانو کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان کە تەواوی بەرژەوەندیو قازانجە ئابوریەکانیان بۆ خۆیان پاوانکردووە، دەبێتە هۆکارو فاکتەرێکی دروستبوونی جەنگ، چونکە هەڕەشەو مەترسیو فاکتەری ئابوری بە مەترسیەکی گەورەی سەر ئاسایشی نەتەوەییو سـەروەری وڵاتـان دادەنـرێـت. دەشێت بە هاوکاریکردنی وڵاتە هەژارەکان لەلایەن وڵاتانی خاوەن پیشەسازیو ئابوری گەورەوە

تا ئاستێکی باش رێگە لەبەرپابونی جەنگو تووندوتیژی بگیرێت.

(یوهان کویتلیب فیختە)ی فەیلەسوفی ئەڵمانی یەکسانیو هاوکاری ئابوری بە هۆکارێکی رێگەگرتن لەبەرپابونی جەنگ دادەنێت، چونکە لەکتێبەکەیدا دەربــارەی دەوڵەتی (نمونەیی) دەڵێت: «سیستمێکی تەواو یەکسانی کۆمەڵایەتیو ئیکتیفای خودیو کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر ژیانی ئابوریو رەخساندنی فرسەتی کارو ژیان بۆهەموانو دابڕانی وڵات لەنەتەوەکانی تر بۆ بە دەستهێنانی ململانێی بازرگانی کە دواتر دەبێتە هۆیەك لە هۆیەکانی رێگەگرتن لە جەنگ»(28).

چونکە بە رای (فیختە)، دەشێت یەکسانی وڵاتانو نەتەوەکان بە تاكو کۆمەڵەکانیانەوە دەستەبەری ئاشتییەکی هەمیشەییو ژیانێکی دوور لە هەڕەشەو مەترسییەکانی جەنگ بکات، پێویستی بوونی دەسەڵاتو کاریگەریو رۆچونی دەسەڵات بۆناو تەواوی لایەنەکانی ژیانی تاکە کەس و کۆمەڵگەدا، یەکێکی تر دەبێت لە فاکتەرەکانی رێگەگرتن لە جەنگ، هەروەها دژی بەشداری بازرگانی نێودەوڵەتی دەوەستێتو دەڵێت: «چوونە ژێرسایەی هاوسەنگی نێودەوڵەتی یاخود بەشداریکردن لە بازرگانی جیهانیدا، هۆکاری لەدایکبونی هەستو گیانی خۆپەرستیو جەنگە لەنێوان ئەڵمانیاو ئەوانی ترداو هاندەری هەوڵدانە بۆکۆکردنەوەی نفوزو کۆنترۆڵکردنو دەستبەسەرداگرتنی جیهان»(29). لێرەدا بیانو بۆ رێگەگرتنی بەشداریکردن لە سیستمی بــازاڕو بازرگانی جیهانی دەهێنێتەوە، دژی بەشداربوونو چوونە هاوکێشەی هاوسەنگی نێودەوڵەتیەو بە فاکتەری دروستبوونی هەستو نەستی خودپەرستیو بەرپابوونی جەنگو بیرکردنەوە دێت لە دەستگرتن بەسەر تەواوی جیهاندا، وەك بیرکردنەوەو خەونەکانی هەریەك لە ئەدۆلف هیتلەرو مۆسۆلینیو ستالین. هەرچەندە فیختە بەمجۆرە باسی جەنگی دەکرد و دژی هۆکارەکانی دروستبونی جەنگ

بوو، بەڵام بۆخۆی هەردەم حەزی دەکرد لە جەنگدا بەشداربێت، «هەڵبەت وەك گوێڕایەڵێك بۆ بڵاوکردنەوەی پرەنسیپەکانی نەك وەك سەربازو جەنگاوەرێك چەك هەڵبگرێت، چونکە ئەمە دژی سروشتی ئەوبوو، بەڵام  بە نەخۆشی کۆلێرا کۆچی دواییکرد»(30).

بەکاربردنی سامانە سروشتییەکان زۆرجار دەبێتە هۆکارێکی تری ئابوری بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ، لەم بارەیەوە (دکتۆر زەهران)، ئاماژە بۆئەوە دەکات: «هەندێك وڵاتە گەشەسەندووەکان روبەڕوی گرفتی خۆبەتاڵکردنەوە دەبنەوە لە سامانە سروشتی و گۆڕانکارییە کەشی و ژینگەییەکان و بڵاوبونەوەی نەخۆشیو برسییەتی، هەروەها هەندێك وڵاتانی تریش توشی گرفتی زیادبونی بێئەندازەی دانیشتوانەکانیان دەبنەوە کە دواکەوتنی بەرهەمهێنانی لێدەکەوێتەوەو دەبێتەهۆی کەمی داهــاتو پەکخستنی هەوڵەکانی نەخشەو پلاندانان بۆ زیادکردنی داهاتی نەتەوەییو بـەرزکـردنـەوەی ئاستی بژێوی، تەقینەوەو زیادبوونی دانیشتوان بە گەورەترین هەڕەشە لە ئاشتیو ئاسایشی جیهانیو دروستبوونی جەنگ هەژماردەکرێت»(31).

واتە ئەو هۆکارانەی دواکەوتنی ئابوریو گەشەسەندنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانو زیادبوونی ڕێژەی داهاتی تاکە کەسو داهاتی نەتەوەییو نەبونی پلانو توانای مامەڵەکردن لەگەڵ سامانە سروشتییەکاندا دروستدەکەن، دەبنە زەمیەنەسازی سەرهەڵدانو بەرپابونی جەنگ.

بە تایبەتی وڵاتانی جیهانی سێیەمو وڵاتانی دواکەوتووی باشوری گۆی زەوی، زۆرترین ڕێژەی سامانی نەوتی خاو و نەوتی سروشتییان تێدایە، کە مامەڵەکردنی سەرکردە و بڕیار بە دەستانی ئەو وڵاتانەش بەجۆرێك بووە هەمیشە بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانیانو زەبروزەنگو خۆقایمکردنو بەهێزکردنی هۆکارەکانی خۆپارێزی بەکارهێنراوە، نمونەی ئەو وڵاتانەش بەپلەی یەکەم عێراق لەسەردەمی سەدام حسێنو دەسەڵاتداری رژێمی حزبی بەعسدا.

هەروەها لەلایەکی ترەوە جیاوازی گەشەسەندنی ئابوری نێوان نەتەوەو وڵاتەکان هۆکارێکی تری سەرهەڵدانی جەنگە، «بۆشایی ئابوری، کە وڵاتــە دەوڵەمەندەکانی باکوری گۆی زەوی‌و وڵاتە هەژارەکانی باشور لەیەکتری جودادەکاتەوە، هۆکاری زۆرێك لەناکۆکی‌و ململانێیەکان‌و هەڕەشەیە لە ئاسایش‌و ئاشتی جیهانی»(32).

ئەوەی زۆرجار ناکۆکی‌و کێشەو جەنگ دروستدەکات، ئەو بۆشایی‌و پانتاییە فراوان‌و گەورەیەیە لە نێوان ئەو دوو چینەی وڵاتاندا هەیە، وڵاتانی باکوری گۆی زەوی بە وڵاتانی پیشەسازی‌و خاوەن کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان‌و ئابوری گەورە ناسراون‌و تواناو داهاتی ساڵانەیان چەند بەرامبەری داهاتی وڵاتانی دواکەوتوو یان تازەگەشەسەندووە، لەگەڵ وڵاتانی باشوری گۆی زەوی کە زیاتر لە کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەفەریقیاو ئەمەریکای لاتیندا خاوەنی ئابوریەکی دواکەتوون و نە پیشەسازین نە کشتوکاڵی، بەڵکو کاری سەرەکی تێیاندا کاری خزمەتگوزارییە. ئەم جیاوازی‌و بۆشاییە زۆرجار وڵاتانی دواکەتو و بەهۆیەوە هەست بە کەمی دەکەن‌و گرفتی دەرونی‌و ئاڵۆزی کەسی‌و بڕیاری سیاسیان وای لێدێت کە بەرەو هەڵگیرساندنی جەنگ لەبەرامبەر وڵاتانی باکوردا ئاڕاستە بکرێت.

ئاشکرایە هەردەم ئاکامی ئەو جەنگانە لەبەرژەوەندی وڵاتانی باکورو زیانی وڵاتانی باشور کۆتایی دێت، ئەمەش دەبێتە هۆکاری زیاتری داتەپین‌و وێرانبونی وڵاتە هەژارەکان‌و خراپبونی بواری پیشەسازی‌و بازرگی‌و قەرزێکی زۆری وڵاتانی پێشکەوتوویان دەکەوێتەسەر.

هەروەها «نــەوت‌و سوتەمەنی بەسەرچاوەیەکی سەرەکی جیاوازیی‌و ناکۆکی‌و ئەگەری دروستبونی جەنگ دادەنرێت»(33). ئەو هەڕەشەو ناکۆکییە دوورودرێژەی وڵاتانی کەنداوی عەرەبی و وڵاتانی پیشەسازی گەورە لەسەر ئەم ناوچەیەو شوێنەکانی تری جیهان کە نەوت‌و پاشکۆکانی تێدایە، سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن.

هەر سەبارەت بەو پێشکەوتنە ئابوریەی ئەمڕۆ و کاریگەری لەسەر دروستبونی جەنگ، «ئەم گۆڕانە ترسناکە لە ئابوری جیهانی، هاوشێوەی خـۆی لە چییەتی کــردەوەی جەنگ لەگەڵ خۆی دەهێنێت(34).

بە واتـا چەندە پەرەسەندن و هۆکارەکانی بەرهەمهێنانیو سەرچاوەکانی گەشەسەندنی ئابوری فراوانبنو پێشبکەون، لەبەرامبەردا مەترسیەکانی هەڵگیرساندنی جەنگو هۆکارەکانی بەرپابونی دەبنە ئەگەری نزیك و حەتمی.

**•هۆکاری سیاسی وئایدۆلۆژیا:**

بە گەڕانەوە بۆ تۆماری سەرجەمی جەنگەکان، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هۆکاری سیاسیو ناکۆکییو ململانێو نەگونجاندنە سیاسییەکان، هەمیشە هۆکارو کاراکتەرێکی سەرەکی هەڵگیرساندنی جەنگەکان بوون، یان لەئەنجامی ململانێو ناکۆکیو نەگونجانی توندی ئایدۆلۆجی و رامیارییە دژبەیەکەکان جەنگ دروستدەبێت، زانایانو توێژەران لەم بارەیەوە هەڵوەێستو جیاوازییان هەیە، لەلایەکی ترەوە ئایدۆلۆژیاو فەلسەفە سیاسیو رامیارییە جیاوازەکان جگەلەوەی لێکدانەوەی تایبەتییان هەبووە بۆ جەنگ، هاوکات خۆشییان هۆکاری سەرهەڵدانو دروستبونی جەنگ بوون. «ئەرکی قوربانیدانی تاك بۆ دەوڵەت بەرزترین  بەهای ئەخلاقییە لای فاشیزم، هەربۆیە جەنگ یاسای سەرمەدیو نەمری مرۆڤە «(35).

فاشییەکانو فاشیزم هەردەم بانگەشەدەکەن بۆسەروەری دەوڵەتو بەپیرۆزییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکـەن، جەنگیش بەهۆکارێکی بەدیهێنانی ئەو نەمریو پیرۆزیو باڵاییە تەماشادەکەنو پێیانوایە جەنگ دەتوانێتو سەروەری دەوڵەت هەردەم لەبڵندیدا بهێڵێتەوە.

نازیەکانیش هاوشێوەی فاشییەکان دەوڵەتیان لەسەروی هەرەمدا

دادەنـاو هەموو شتەكانی تریان دەخستە خزمەتی سیستمێكی دیكتاتۆریەتەوە، داوای دامەزراندنی دەوڵەتێكی دیكتاتۆرییان دەكـرد، (فۆهرەر) سەركردایەتی بكاتو سەرجەم ئەڵمانییەكان بەتاكەكەسو ڕێكخراوەكانەوە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا كۆبكاتەوە. هەروەها داوای دەكرد ڕێكەوتننامەكانی ئاشتی هەڵوەشێتەوەو ئەو ناوچانەی داگیرگەی ئەڵمانیابوون پێیان بدرێتەوەو مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنەكاندا لەجولەكەكانی نیشتەجێی ئەڵمانیا بسەندرێتەوەو سوپایەكی نیشتمانی پێكبهێنرێت. هاوكات بڕوایانوابوو دەوڵەت دەستبخاتە ژیانی ئابوریەوە، ئەویش لەڕێگای دانانی نەخشە و پلانی پێویست، لەگەڵ دابینكردنی كارو نەهێشتنو بنەبڕكردنی مانگرتن(36).

بەم پێیە هەموو هەوڵێك لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتو باڵادەستی سیستمێكی دیكتاتۆری لای نازییەكان ڕێگەپێدراوە، بەجۆرێك كاركردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەر پرۆژەیەكی ئاشتی لەجیهاندا دەبێت كاربۆكراوبێت و برەو بە جەنگو زەبروزەنگی سیاسی بدرێتو جیاوازی ئایدۆلۆژی بە دروستكردنی سوپایەكی نیشتیمانی بەرپەرچ دەدرێتەوەو ڕێگە بە هیچ جۆرە مانگرتنو خۆپیشاندانێك نادرێت، چونكە هۆكاری پێشێلكردنی پیرۆزییەكانی دەوڵەتە.

پلانی ئاشتی هەمیشەییو جیهانگر، بەرهەمی ساڵی(1789) ی (جێرمی بنتام)ە پاش نیوسەدە ناسرا. لای بنتام رەگی جەنگەكان ململانیی بازرگانییەو لەبەر ئەمە ئەو سیستەمی كۆلۆنیالیزم تاوانبار دەكات. باسی ئەم وتە بەناوبانگەی (رۆبسپێر)(*)ی دەكرد ئەگەر هەموو كۆلۆنییەكان تێدابچن، لـەوە باشترە بنەمایەكی بڕوایی تێدابچێت. هەروەها ئەو یاداشتێكی بۆ (كۆنوانسیۆن)(**) نارد و تێیدا داوایلێكردن واز لەكۆلۆنیاكان بێنن. ئەم بۆچوونانە لەوكاتەدا باوبوون، چونكە كۆنوانسیۆن لە مانگی (ئازاری1970)دا بڕیاریدا فەرەنسا واز لەجەنگ بۆ داگیركردنی وڵاتانی دیكە بهێنێت و هیچ كات هێزی خۆی

دژی سەربەستی نەتەوەکانی دیکە وەگەڕنەخات (37).

سیستەم‌و ئایدۆلۆژیای کۆڵۆنیالیزم‌و داگیرکردن لەسالآنی رابردودا هەمیشە هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆهەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان وڵاتانی داگیرکەر (کۆڵۆنیالیزم) و وڵاتانی داگیرکراودا، ئەو دیالۆگ‌و نامەنوسینەی نێوان رۆبسپێرو کنوانسیۆن کە جیرمی بنتام باسی دەکات، کارکردن بووە بۆ نەهێشتنی سیاسەتی کۆڵۆنیالیزم، رێگەخۆشکردن بووە بۆ سەربەخۆیی دوور لە جەنگی نەتەوە داگیرکراوەکان. گەر هەر نەتەوەیەك توانی سەربەخۆیی بەدەستبخاو هاوسەنگی سیاسی‌و هێز لە نێوان نەتەوەکاندا پەیڕەوکراو سیاسەتی پێکەوە ژیانی نەتەوە و وڵاتەکان کاری پێکرا ئەوا جەنگ ئەگەرێك دەبێت کە رودان‌و بەرپابوونی دەبێتە ئەگەرێکی دوور.

شارستانیەت و سەردەمە جیاوازەکان هەمیشە تێگەیشتن‌و بیرکردنەوەی جیاوازو نوێ دەهێننە کایە، هەرشەپۆلێك شارستانیەتێکی نوێ لەگەڵ خۆی دەهێنێت، بە وتەی شەپۆلی سێیەم، ئێستا ئێمە لەناو دیاردەی شارستانی شۆڕشی سێیەمداین کە ئابوری‌و شێوەکانی خێزان‌و نێوەندەکان‌و سیاسەتی تایبەت بەخۆی هەیە(38)، واتا جـۆری پەیوەندی‌و بیرکردنەوەو پێکهاتەی دامــەزراوە سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەکان کاریگەرییان دەبێت لە شێوازی بەرپابوونی جەنگ‌و بیرکردنەوەکان، چۆنیەتی هەڵگیرساندنی جەنگ‌و مامەڵەکردن بەپێی ئەو سنورو ئایدیایەی فەلسەفەیەکی سیاسی دیاریدەکات، گۆڕانی بەسەردادێت.

هەروەها ناتوانرێت بە هۆی هەڵسەنگاندنی توانای سەربازییەوە پێشبینی سەرهەڵدانی جەنگ بکرێت، چونکە ژمارەیەك فاکتەری گرنگ رۆڵیان لە روودانی جەنگدا هەیە، هەندێکجار وڵاتانی لاوازتر و بە ئومێدێکی کەمی سەرکەوتنەوە، پەلاماری رکەبەری بەهێزتری داوە. لەوانەیە بڕیارێکی لەوجۆرە هەڵسەنگاندنێکی هەڵەی ئەنجامێکی

جەنگ بێت. جگەلەوە دەتوانرێت بەدەستهێنانی هەندێ مەرام، یان قبوڵنەکردنی دۆخی نە جەنگ نە ئاشتی بەهۆیەکی سەرهەڵدانی جەنگ دابنرێت (39).

لەم دۆخەدا زیاتر هەستی ناسیۆنالیستیو نەتەوەیی زاڵدەبێت بەسەر توانستی بیرکردنەوەداو ئەگەری سەرهەڵدانی جەنگ دێتە ئـارا، چونکە هیچ نەتەوەیەك خۆی بە کەمتر لە نەتەوەکانی تر نازانێت و ئامادەیە بە جەنگ ئەوگریمانەیە بسەلمێنێتو پێیوایە ئەو جەنگە دەتوانێت هەستو گرێی خۆبەکەمزانی لەناوبەرێت، تەنانەت هەندێکجار نەتەوەو دەوڵەتێکی بێهێز یاخود لاواز لە رووی تەکنەلۆژیاو توانای سەربازیو ئابوریو پیشەسازییەوە، جەنگی لەگەڵ وڵاتێکی بەهێزو خاوەن توانای سەربازیو ئابوریو پیشەسازیدا بەرپاکردووە و زیانەکەش بەسەر وڵاتە لاوازەکەدا شکاوەتەوە. وەك چۆن بە کورتی دەبێت بڵێین ئەو گلەییانەی دەبنەهۆی دەرکەوتنی دوژمنایەتی، لە هەموو سەردەمێکدا هەن. پرسەکە ئەمەیە  چۆنە دوژمنایەتی لە فڵانە چرکەی تایبەتدا دەرکەوێت. بەڕای ئێمە، ئەمە بە تایبەت بونیادی حەشیمەتییە کە چرکەی پێکدادان دیاریدەکات. ئەو نەتەوەیەی تازە شەڕی تێپەڕاندووە، بەخراپترین هاندانیش نابزوێت. هەربەم بۆنەوە، جەنگی پێشگیرانە کە هەندێك مێژوونوس بۆ دەوڵەتان پەسندیانکردووە، روونادات، چونکە ئەم جەنگە لەکاتێکدا روودەدات کە لەگەڵ بونیادێکی حەشیمەتی لەباردا هاوئاهەنگ بێت(40).

بەم پێیە ئەو یادەوەرییانەی رابـردوو کە نەتەوە تێیدا ژیاوە دەبێتە بەرهەمێنەری جەنگ، وەك چۆن ئەو یادەوەرییە تاڵانەی جەنگ لەسەر رابردوی نەتەوەیەك بەجێیهێشتووە، رێگرو بەربەستی بەرپابوونی جەنگ دەبێت، چونکە ژیرانە نییە گەر لە شکستو تاڵاوی جەنگێك تێنەپەڕیبێتو بازبدەیتە ئاگرو خۆڵەمێشی جەنگێکی ترەوە.

بیرکردنەوە و ئایدۆلۆژیای باڵای توندوتیژ گەر لەحکومەتدا بێت یاخود ئایدۆلۆژییایەکی بڵاوبێت دەتوانێت زەمینەسازی بۆ بەرپابونی جەنگ بکاتو بە ئامانجی ئەوەی خاوەن سەروەرییە و شانازی بە توانای خۆی (مەبەست لەئایدۆلۆژییاکە)، مافی دەستپێشخەری هەیە لە جاڕدانی سەرەتاکانی جەنگدا، لەروانگەی پۆلیمۆلیژییەوە هەموو جەنگێك لایەنێکی هێرشکاری هەیە، ئەم هێرشکارە کەسێکە مەیلی شەڕخوازی تێدا گرژترە، یان زیاتر حەزی لە جەنگە یان تەنانەت ناهۆشیارانە بەوپەڕی حەزەرەوە زەمینەی  روودانی جەنگ خۆشدەکات.

هەندێك فەلسەفە و ئایدۆلۆژیاو بیری سیاسی هەیە کە زۆرینەی کات کاریان لەسەر لەخشتەبردن و هەڵفریواندنی جەماوەرو کۆمەڵگە هەبووە، تاوەك میکانیزمێك بەکاربهێنرێن بە مەستی گەیشتن بە دەسەڵات، یاخود هەرمەبەستێکی تر کە خۆیان  دیارییانکردووە.

هەندێك ئایدیا کە بانگەوازی مەرگ دۆستی یاخود ژیان دۆستی دەکەن، تێگەیشتنیان بۆ جەنگ جیاوازە و دەبنەهۆی سەرهەڵدانی جەنگ، لەم بارەیەوە هەر لەکۆنەوە تائێستا گەلێك گریمانە هێنراوەتە ئارا، پاش پرۆدۆن، (کۆنتۆن) لایوایە جەنگ لەڕێگەی (مردنی کەسانەوە یارمەتی مانەوەی جۆری مرۆڤ دەداتو باشترینو بەهێزترین کەسان هەڵدەبژێرێت، بەڵام ئاشتیخوازان وەڵامدەدەنەوە کە ئەم هەڵبژاردنە، (هەڵبژاردنێکی روو لەوێرانی)یە، چونکە جەنگ بە پێچەوانەوە بەهێز و گەنجترین مرۆڤەکان لەناودەبات(41).

ئەمە ئەوەمان پێدەڵێت جەنگ سروشتێکی سیاسسیانەی هەیە لەبەرئەوەی خۆویستانە ئەنجامدەدرێت و کۆمەڵەیەکی دیاریکراو ئەنجامیدەدەن، لەئاکامیشدا هەر ئەو کۆمەڵەیە دەبنە قوربانی پرۆسەی جەنگ، چونکە بانگەوازی ئەوە دەکات کە لەپێناوی مانەوەی مرۆڤدا پێویستە کەسانێکی تر و کۆمەڵە مرۆڤێکی تر بمرن و قوربانی بدەن.

**•هۆكاری تەكنەلۆژیا:**

لێكۆڵینەوە لەو سیناریۆیانە، كە فاكتەرەكانی سەرەوە دەكەونە ژێر كاریگەری تەكنیكی سەربازییەوە بایەخی خۆیان هەیە، لەم لێكۆڵینەوەیەدا باس لەو دۆخانە كراوە كە تیایاندا بەكاربردنی تەكنیكی سەربازی بووەتەهۆی ئاڵۆزكردنی مەسەلەی پێشبینی ئەنجامی جەنگەكەو ئەگەری هاتنەدی ژمارەیەك ئامانجی زیاتر.

یەكێكی تر لەكاریگەرییەكانی زۆربوونو دەستكەوتنو بەرهەمهێنانی پێشكەوتنێكی زۆر لە رووی چەندایەتیو چۆنایەتی (چەك) وەك فاكتەرو بەكاربەری سەرەكی لەجەنگدا، چونكە دەبینین بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، كە وڵاتانی زلهێز و خاوەن توانای ئابوری سەرقاڵی پێشبڕكێی خۆ پڕچەككردنو بەدەستهێنانی پێشكەوتووترینو بەهێزترین جۆرو تەكنەلۆژیای جەنگن، تا لەلایەك پارێزگاری خۆیانی پێبكەن، لەلایەكی تریش كاربكەن بۆ پاراستنی ئەو هەیمەنەو پێگەیەی لە كۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بەهەر شێوازو هۆیەك بێت بەدەستیانهێناوە.

لەم بارەیەوە (ئەحمەد زەهـران) نوسیویەتی: «بازرگانیكردن بەچەك، بەشێكی سەرەكیو گرنگی بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانە، خاڵی پێككگەیشتنی سەرەكییەو پەیوەستە بەململانێكان، كە رەنگە ببێتە هۆكاری ململانێی ئەتۆمی جیهانی لە نێوان زلهێزەكاندا»(42).

بەم پێیە ئەو پێشبڕكێو هەڵمەتی خۆ پڕچەككردنەی وڵاتان ئەنجامیدەدەنو بازرگانیكردن بە چەكەوە، ئەگەری دروستبونی جەنگێكی گـەورەی لێدەكرێت كە زۆرترینو گەورەترن قوربانی لێبكەوێتەوە، چونكە زۆرینەی وڵاتانی جیهان خەریكی بازرگانی كردنن بە چەكەوە بێ ئەوەی بیر لە ئاكامەكەی بكەنەوە .

بڵاوبونەوەی چەكی ئەتۆمی لەجیهاندا، بەتایبەتی وڵاتانی جیهانی سێ كە بواری بەدەست هێنانیان بۆ رەخساوە، بەكارهێنانی تەكنەلۆژیای

ئاوێتەبوو بە ئەتۆم، گەر بوار بڕەخسێت لە بەرکارهێنانی وزەی ئەتۆمی لەبواری ئاشتی بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی. هەندێك وڵاتی جیهانی سێیەم وەك چین، هند، ئیسرائیل، لەبەرکارهێنانی سەربازیانەی وزەی ئەتۆمیو بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی، هەندێك وڵاتی تریش هەیە وەك پاکستان، بەرازیل، یابانو هتد کە ئامادەن بۆپەیوەندیکردن بەیانەی ئەتۆمییەوە، هەرچەندێك ژمارەی دەوڵەتانو ئەندامانی یانەی ئەتۆمی زیادبێت، جگە لەبڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی لەجیهاندا، ئەوا هێندەش ئەگەری بەرپابونی جەنگی ئەتۆمی ئەگەرێکی رەوایە(43).

فرسەت پێدانو بوار پەیدابوون بۆ بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمیو ئاسایی بوونی مافی خاوەندارێتی چەکی ئەتۆمی، بە تایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، بۆتە هەڕەشەو ترسێکی گەورە لەبەرپابوونی جەنگی ئەتۆمی، چونکە ئەو وڵاتانەی جیهانی سێیەم کە خاوەنی وزەی ئەتۆمینو توانای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمییان هەیە (بە کۆماری ئیسلامی ئێرانیشەوە کە لە ئێستادا دۆسیە ئەتۆمییەکەی بۆتە مایەی گفتوگۆو هەڕەشەو توندوتیژی نواندن) وڵاتێکن هەمیشە لە بارودۆخێکدا دەژین کە بڕیاردان بۆبەرپابوونی جەنگ بڕیارێکی ئاساییە، لەکاتێکدا ئەوان خاوەنی چەکی ئەتۆمین، بۆیە هەرجۆرە بڕیارێکی لەوشێوەیە هەڕەشەیە بۆسەر ئارامیو ئاسایشی جیهان.

ئەمە جگەلەوەی هۆکارێکی تر بریتییە لەوەی کە «بەهیچ جۆرێك بواری بازرگانیکردن بە کڕین و فرۆشتنی چەکەوە لە جیهان، هەروەها بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی، ناکەونە ژێر کۆنترۆڵی نێودەوڵەتییەوە، بەهەمانشێوە لای وڵاتە زلهێزەکانیش»(44).

بە واتای بەرهەمهێنانو خاوەندارێتی چەکی ئەتۆمی چەندە ترسناکە، لەوەش ترسناکتر ئەوەیە بازرگانیکردن بە کڕینو فرۆشتنی چەك لە سەرانسەری جیهانداو بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمیو دروستکردنو بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن وڵاتانەوە بەهیچ

جۆرێك لەژێرچاودێریو ڕێنمایی و کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا نییە، بۆیە لەم حاڵەتە دروستبوونی جەنگ شتێکی حەتمی دەبێت، چونکە هەموو لایەنە جیاواز و ناکۆکەکان خاوەنی چەکن و هیچ کۆنترۆڵێك نییە ڕێگەیان پێنەدات هێز بەکاربهێنن لە یەکلایی کردنەوەی کێشەکانیاندا.

ئەگەرچی زۆرجار وڵاتان چەکی ئەتۆمی بەبیانوی ڕێگەگرتن لەبەکارهێنی ئەو چەکە لەلایەن بەرامبەرەوە بەکاردەهێنن، چونکە دەڵێن دەیانەوێت ڕێگە لەوێرانی ئاکامی بەکارهێنانی چەکەکە بگرن، «گەشەسەندنی موشەکی بالیستی دورمەوداو ئەتۆمی لەپێشەوەی گرنگیپێدانی زانایانی ئەم بوارەن، ئامانج لێی دروستکردنی کڵاوەی ئەتۆمییە کە تواناى پێکانی ئامانجەکەی هەبێت لە دوراییەکی زۆردا. هەریەك لە دوو وڵاتە زلهێزەکە خواستیان بوو بگەن بە تێکشکاندنی موشەکی بالیستی ئەتۆمی بەرامبەر، بەر لەسەرکەوتنی لەپێکانی ئامانجەکەی کە بۆی ڕەوانەکراوە، بە مەبەستی دابینکردنی سەلامەتی ئامانجە زیندووەکانی هەر لایەکیانو ڕزگارکردنی لەوێران بوون، لە چرکەکانی سەرەتای جەنگدا»(45).

دەگونجێت بۆڕێگەگرتن لەبەرکارهێنانی ئەتۆم بۆ داگیرکردن یان وێرانکردنی وڵاتێکی تر، لەلایەن وڵاتانی خاوەن ئەو چەکەوە و بە هەمان جۆری چەك ڕێگەی لێبگیرێت، ئەمەش هۆکار یاخود بیانویەکی لە مێژە بۆ بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمی و چەکی ئەتۆمی لەلایەن وڵاتانەوە.

بەم پێیە سەرجەمی وڵاتان هەوڵدەدەن ببنە خاوەنی کورەی ئەتۆمی بۆ بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمیو بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی، چونکە بۆتە پێویستییەکی واقعی لەئێستادا بۆبەرگری لە خۆکردن لەلایەن وڵاتانەوە، «بە کۆتایی هاتنی جەنگی سارد، لە ستراتیژی جیهانیدا گۆڕانکاری بەسەر چەکی ئەتۆمیدا هات،

بەرپەرچدانەوە لە روبەڕوبونەوەی هێزە نوێیە سەرکەوتووەکاندا نەیتوانی سەرکەوتووبێت، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری پەیوەندی بە بواری دەرونییەوە هەبو و پشتی دەکردە سەر باش هەڵسوکەوتکردنی بە کۆمەڵ، ستراتیژییە نوێیەکان لە جیهاندا پێویستی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی پێناسەو رۆڵو ئامانجو سیستمی بەرگری‌و سەربازی کردە بڕیار بەسەر وڵاتاندا و سەپاندی، لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتانی زلهێز بەردەوامن لەسەرئەوەی پشت بکەنە بەرپەرچدانەوەی چەکی ئەتۆمی، لەکاتێکدا زۆرینەی وڵاتانی دونیا کە نەیانتوانیووە ببنە خاوەنی ئەو چەکە، بەڵام لەئێستادا هەوڵدەدەن ببنە خاوەنی وزەی ئەتۆمی‌و توانای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی، یان لانی کەم بیر لەوەدەکاتەوە چۆن ببێتە خاوەنی ئەو چەك‌و وزەیە»(46).

لەگەڵ ئەمەدا چەك‌و بیرۆکەی جەنگی کلاسیکی پێگەی خۆی لەدەستنەدا، «بەم پێیە هاوسەنگی ئەتۆمی لەسەر بەردەوامی بەرپەرچدانەوەی ئاڵۆگۆڕ وەستابوو، یان بەواتایەکی تر توانای هەریەکە لەلایەنەکانی یەکێتی سۆڤییەت‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تێکشکاندنی یەکتری لە هەڵگیرساندنی جەنگی ئەتۆمیدا لە هەر ساتەوەختێکدا بێت»(47).

ئاسایشی جیهان‌و هاوسەنگی هێزەکان وەستابووە سەرئەوەی سەرۆکی هەریەك لە جەمسەرەکانی رۆژئاوا و رۆژهەڵات، خاوەنی چەکی ئەتۆمی بوون لەلایەك، توانایان هەبوو هێرش‌و موشەکی یەکتری پوچەڵبکەنەوە و شکستی پێبهێنن لەکاتێکدا گەر بکەونە ناو جەنگ‌و دروستبوونی جەنگی ئەتۆمیەوە، بەڵام ئەم دژە هێرشە، یاخود ئەم گریمانەیە تاسەر بەردەوام نەبوو، یان نەیتوانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، «ئەو هۆکارەی رودانی جەنگی ئەتۆمی کردە ئەستەم، هەردوولا بوون کە هەستیاندەکرد ئەو جەنگە بریتییە لە جەنگێکی خۆکوژی‌و لەناوبردنی خود، بۆیە بیرۆکەی جەنگی کلاسیکی

ئەلتەرناتیڤو جێگرەوەی ڕوودانی جەنگی ئەتۆمی بوو، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ جەنگی (کلاسیکیو ئەتۆمی) لەنێوان یەکێتی سۆڤیەتو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕووینەدا، بەڵکو وڵاتانی تری ناو هاوپەیمانێتییەکان جەنگی ئەو دوو زلهێزەیان دەکرد، کە هەریەك لەو دوو وڵاتە پشتگیری داراییو سەربازییان پێشکەشدەکردن»(48).

هاوکات بەتەنیشت چەکی ئەتۆمی چەندین جۆر چەکی پێشکەوتوو هەیە و هۆکارە بۆ بەرپابوونی جەنگ «ئەگەر چەکی ئەتۆمی، مایەی مەترسی سەرەکی بێتو هەڕەشەبێت بۆ بنەبڕکردنو فەوتاندنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی لە جەنگی جیهانی ئایندەدا، ئەوا چەکی کیمیاویو بایۆلۆژی هاوتایەتی لەوێرانکردنی سەرتاسەریدا»(49).

پێشکەوتنی بەردەوامی زانستو تەکنەلۆژیا کاریکرد لەگەڵ مەترسی چەکی ئەتۆمیدا، هەڕەشەی کۆمەڵێك داهێنانی زانستی تر هەمیشە ئامادەیی هەبێت، کە مایەی مەترسین لە مانەوەی مرۆڤایەتیو ئەو پێشکەوتنانەی بەدەستیهێناوە.

**•هۆکاری ئاینیو مەزهەبی:**

ئەگەر چی ئەفسانە لەجیهانی مۆدێرن گرنگتری کەمە یاخود هەر نییەتی، بەڵام زیندوکردنەوەی ئایین لەدونیای مۆدێرندا، زیندوکردنەوەی ئەفسانەکانە لەدونیایەکدا کە بەرامبەر دەرکەوتنی دووبارەی ئەفسانەکان بەرگری لەخۆی دەکات، بۆیە دەپرسین ئایا ئەم بەریەککەوتنە زەمینەسازی توندوتیژی ئاینیو توندوتیژی دژە ئاینی نییە؟ لەکاتێکدا زۆرجار نەگونجانو دژیەکی ئاینو مەزهەبەکان بە جەنگ کۆتاییدێت، لاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی پابەندی مەزهەبو ئاینێکن، بێڕەچاوکردنی لێکبوردنو پێکەوە هەڵکردن، چونکە ناکرێت ڕۆڵی ئاین بەکەم بگیرێتو مامەڵەیەکی ژیرانەی لەگەڵ نەکرێت، بەتایبەتی لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتو

وڵاتانی جیهانی سێیەم و دواکەوتوودا، هەموو ئەو راستییە دەزانین کە رۆژهەڵاتییەکان بەوەناسراون زۆر دەمارگیرانە مامەڵە لەگەڵ ئاین دەکەنو پێوەی پابەندن، «ئیسلام وەك هەر ئاینێکی ئاسمانی، تەنیا هەر سیستمێکی فەلسەفیو مەعریفیو میتۆلۆژی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی ئەنترۆپۆلۆژیشە، لایەنێکی لەو تێکستانە پێکدێت کە بنەماو سیستمی فیکریو فەلسەفیی ئاینەکە پێکدێنن، قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر، لایەنێکی دیکەی پەیوەندیی بەمرۆڤەوە هەیە، واتا مرۆڤ چۆن لە تێکستە ئاینەکان گەیشتووە، چۆن لە واقیعدا کاری پێکردوون، تاچەند ئاینەکەی بۆبەرژەوەندی کەسی و چینایەتی و نەتەوەیی بەکارهێناوە»(50).

واتا مامەڵەکردن لەگەڵ ئایینی ئیسلام پەیوەندی بەجۆری تێگەیشتنی تاكو وەرگرو پەیڕەوکاری ئاینەکەوە هەیە، کەسێك گەر تەنها وەك پەیوەندییەکی رۆحی لەنێوان خودی خۆیو خوداکەیدا ئایین وەربگرێت، ئەوا زۆر میانڕەوانە مامەڵەی ئەو رووداو و پێشهاتە ئایینیو مەزهەبییانە دەکات کە روودەداتو بەرەوڕوی دەبنەوە، بەڵام کەسێکی دەمارگیرو توندڕەو بێ هیچ بیرکردنەوەیەك کاردانەوەیەکی توندوتیژیانەی دەبێت کە دەشێت ببێتە هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگێکی ئاینیو مەزهەبی.

«سەرئەنجام لە ئاینی ئیسلامو هەر ئاینێکی دیکەی ئاسمانیدا چەندان مەزهەبی جیاواز هەن، هەر هەموویان رەوایی خۆیان لە خودی ئاینەکانیانەوە وەردەگرن، هەموویان خۆیان بە راسترو بگرە بە راسترین دەزانن، هەربەم ناوەشەوە یان هەر بەپێی ئەم شەرعییەتی خۆبەڕاست زانینە، لایەنگرانی دیکەی ئاینەکە، کە سەر بە مەزهەبی جیاوازنو بە لادەر لە ئاین دەزاننو بە توندی پەلاماریان دەدەن، رەنگە ئەو کوشتارە گەورانەی لەسەر جیاوازی مەزهەبی، لەنێوان لایەنگرانی یەك ئاییندا کراون لەو کوشتارانە زیاتربن لەنێوان لایەنگرانی دوو

ئایندا، بۆنمونە کوشتاری نێوان کاسۆلیكو پرۆتستانەکانی سەر بەئاینی مەسیحی، کوشتاری نێوان سونەکانو شیعەکانی سەر بە ئاینی ئیسلام، هتد»(51).

ئەو راستییە لەئەنجامی پابەندبوونی توندڕەوانەو دەمارگیرانەوە بووە، بێ ئەوەی گەڕانەوەیەکی ژیرانەو تەندروستانە هەبێت بۆ سەرچاوە سەرەکییەکەی خودی ئاینەکە، کاتێکیش ئەونەریتو دەسەڵاتە ئایینی و مەزهەبییە گواسترایەوە بۆ ستراکتۆری کۆمەڵایەتیو سیستمو پێکهاتەی دەوڵەتی نەتەوەیيو ناسیۆنالیزم، بەهەمانشێوە عەقڵیەت و هەستی مەزهەبگەرایی رۆڵو کاریگەرییەکانی خۆی لە دەستنەدا، بەڵکو زۆرجار بونە هۆکارو سەرەتای دروستبوونی کیانی سیاسی سەربەخۆو جیاواز.

«کەلتوری سیاسیو ستەمی سەدانساڵەی دەوڵەتی تیۆکراتی لە دژی هەر رەگەزێکی جیاوازی ئایینی، مەزهەبی، سیاسی، نەتەوەیی، بووە بەشێکی چەسپاو لە سروشتی دەوڵەتی ناسیۆنال- خێڵەکی، کاتێك ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم، وەك ئایدۆلۆژیای دەوڵەت، جێگای ئایدۆلۆژیای ئاینی گرتەوە، داپڵۆسینی مرۆڤ و ستەمی ئاینی و مەزهەبی بەرامبەر بە کەمایەتی نەتەوەیی، ئاینیو مەزهەبی بەردەوامبوون، ستەمو چەوساندنەوە بوونە بەشێك لە سیستمی فیکری- ئایدۆلۆژیو کەلتور و نەریتی سیاسی دەوڵەتی ناسیۆنال- خێڵەکی وەك تورکیا، ئێران، سوریا و عێراق، کە لە سەربنەمای ئایدۆلۆژیای زۆرایەتی (نەتەوەیی یان مەزهەبی) دامەزرێندراون، ئەم دەوڵەتانە پاشماوەی جۆرە ئیمپراتۆریایەکن کە ستراکتۆری کۆمەڵایەتییان خێڵ، ئایدۆلۆژیایان ئاینو ئابوریەکەیان دەستکەوتو تاڵان بوو. ئەمانە میراتگرێکی سروشتیی کەلتورو نەریتی سیاسی سەدان ساڵەی ئەو ئیمپراتۆریانەن، هەمان کەلتورو نەریتی سیاسی ئەوان بەرهەمدێنەوە»(52).

زۆرجـــار ئـەو کێشەو ناکۆکیانەی لە نێوان دوو دەوڵـەتـدا دروستدەبێت و بە جەنگ کۆتاییدێت، هۆکارەکەی جیاوازی ئەو دوو دەوڵەتەیە لە رووی ئاینی و مەزهەبییەوە، کە رەنگدانەوەی زۆری لەسەر ئایدۆلۆژیاو سیستمی حوکمڕانیو پەیوەندی دەرەکییان هەبووە، هەروەك ئیبن خەلدون دەڵێت: «دەوڵەتی بەهێز ئەسڵەکەی ئایینە»(53). ئەو دەوڵەتانەش دەیانەوێت رەسانایەتی خۆیان بە هۆی پابەندبونیان بە ئاینو ئامرازی جەنگ بسەلمێنن. نمونەش دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامییە، کە هەڵگری عەقیدەی ئاینیو مەزهەبی بوو، «بەڵام لەبەرئەوەی کێشە فیکریو مەزهەبیو سیاسییەکانی نێودەوڵەتی عەرەبی ئیسلام بـــەردەوام بە توندی پـەلامـاردەدران و کوشتاری بە کۆمەڵیان لێدەکەوتەوە، ئەوا ئەوکێشانە بـەردەوام سروشتێکی زەبرئامێزو خوێناوییان بەخۆیانەوە دەگرت، کوشتارو توندڕەویو بەرهەڵستی بەردەوامی دەوڵەت دیارترین سروشتی کەلتوریو نەریتی سیاسی خەڵکی ئەو ناوچانە بوون(54).

لەو دەوڵەتانەدا کێشەو بیروڕای جیاواز قبوڵنەدەکراو هەر جیاوازبونێکی فیکریو مەزهەبی بە توندوتیژی و جەنگ وەڵام دەدرایەوە و سەرکوتدەکرا، بۆیە سروشتی ئەو دەوڵەتانە سروشتێکی خوێناویی بووە، بە جۆرێك هیچ دەوڵەتێك نییە تا بە نمونە وەربگیرێت کە بەم شێوازەی توندوتیژیو توندڕەویو دەمارگیری ئایینیو مەزهەبی کاری نەکردبێت، لەو وڵاتانەی کە خۆیان بە پەیڕەوکاری ئایینی ئیسلام دەزانن.

«ئیسلام وەك هەموو دینەکانی تر سیستمێکی ئەخلاقی پێکدەهێنێت، لە ئیسلامدا هیچ تیۆرییەکی سیاسی- ئابوری دیاریکراو دەربارەی چۆنیەتی دەسەڵات بەڕێوەبردنو چۆنیەتی دامەزراندنی حکومەتی دینی نییە، لەبەرئەوە گۆڕینی هەر سیستمێکی ئەخلاقی بۆ رژێمێکی سیاسی، هیچ بنچینەیەکی بابەتی نییە(55).

دەكرێت بڵێین تەواوی ئەو ئاڵوگۆڕانە بە كردەوە و پرۆسەیەكی جەنگی یاخود ئاكامی ڕوودانی جەنگێك بەڕێوەچووە، گۆڕینی یەك لە دوایەكی تەواوی ئەو سیستمانە هۆكارێك بووە بۆلاوازی ئەو دەوڵەتانە لەلایەك، لەلایەكی تـرەوە هەمیشە لە پاشخانو باڵایی بیرۆكەو پێویستی جەنگدا ژیاون. هەروەها «ئاینی ئیسلام لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا شكستی بە دیموكراتیو لیبرالیزم هێناو ترسو هەڕەشەیەكی گەورەی لەسەر لیبرالییەكان دروستكردووە»(56).

بۆیە نەگونجانو هەڕەشەی ئیسلام وەك ئاینێكی خاوەن پەیڕەو و مێژوو بۆسەر سیستمی دیموكراسیو لیبرالیزم لەسەردەمی ئێستا، بەیەكێك لەگەورەترین مەترسییەكان دادەنرێتو دەشێت سەرەتای هەڵگیرساندنی جەنگێكی گەورەتری هاوشێوەی (11ی سێپتەمبەر) ی لیبَكەوێتەوە، هـەروەك (ساموێل هانتگۆن) ئاماژەی بۆدەكات «جەنگە ئیسلامیەكان، ئەو جەنگانەن موسڵمانان دژ بە ناموسڵمانانو هەروەها دژ بەخۆشیان دەیكەن، لەسەرئەم بنەمایە، بەگژداچونی كەلتوری نییە، بەڵكو بەگژداچونەوەی كەلتورێكە كە ناوی ئیسلامە دژ بەئەوانیتر»(57).

چەند هەڕەشەو هۆكاری هەڵگیرساندنی جەنگەكە توندتربێت، هێندە ئاكامو ئاڕاستەی جەنگەكە گشتیگرتر، فراوانتر و كاولكاریتر دەبێت، چونكە لە ساتەوەختێكی لەوجۆرەدا جگە لە ئیسلام و لە ئیسلامیشدا ئەوەی جەنگەكە دەكات، ئەوانی تر بە ئامانجی جەنگ دەناسرێن.

ئاینی مەسیحیش وەك هەرئاینێكی تری ئاسمانیو زەمینی بۆتە بەشێك لەجەنگە ئاینییەكان ئیتر بەهەردو ئاڕاستەی جەنگ لەگەڵ كەسانی نامەسیحی لەلایەك، مەسیحیە مەزهەبو پەیڕەو جیاوازەكان لەلایەكی تـرەوە، «كاسۆلیكەكان تەنها لەبەرئەوە پڕۆتستانتەكان ئازارو لەناودەبەن، چونكە ناڕەزایی لەبەرامبەر (پاپ) و (عەشای

ڕەبانی) و هەندێك مەسەلەی دیكەی مەزهەبیدا دەردەبڕن، كە نە لە (كتێبی پیرۆز)دا بەڵگەیەك لەسەر راستبونیان هەیە، نە بەڕاشكاوی ئاماژەیان پێكراوە، لەكاتێكدا پرۆستانتەكان بە نۆبەی خۆیان دان بەوەدادەنێن هەمیشە (مەسیح) وانەی عیشقو خۆشەویستی پێوتون، سەرەڕای ئەوە خۆیان لە رابردودا كاسۆلیك بوون، بەڵام بەهۆی ئەو نەفرەتەی دەرهەق بە كاسۆلیكەكان هەیانبوو، ئازار و ئەشكەنجەیان دەدان، هۆكاری جەنگ داسەپاندنی باوەڕەكانو لێكنەبوردنێكە كە هەردوو گرووپ لەبەرامبەریەكدیدا ئەنجامیدەدەن، بە مەبەستی چارەسەركردنی مشتومڕ و جەنگ، دەبێت هەردوولا بەرامبەر بە یەك لێبوردووبن دەستبەرداری سەپاندنی باوەڕەكانیان بن»(58). بەشێكی زۆر لەوجەنگانەی لەنێو پەیڕەوانی ئاینێكدا روودەدەن بە هۆی جیاوازی راڤەكردنو تێگەیشتنو مامەڵەكردنەوە دروستدەبێت لەگەڵ دەقە پیرۆزەكان، بەتایبەتی لەكاتێكدا كە هەردوو گروپەكە خۆیان بەراستتر دەزانن و گرووپی بەرامبەر بە هەڵە و لەڕێلادراو دەدەنەقەڵەم و لەم بارەیەوە هیچكام لە گرووپەكان ئامادەی سازشكردن و لێكبوردنی بەرامبەر نین و تەنها بە گیانو رۆحییەتی تۆڵەكردنەوە و بەسزاگەیاندنی دنیایی‌و دینی مامەڵەی بەرامبەر دەكەن.

شێوازو رێگەی سەپاندنی ئاینی مەسیحی بەسەر ئەوكەسانەدا كە بێ باوەڕبوون یان تازە دەبوون بە مەسیحی، هۆیەكی دیكەی ئەو جەنگو توندوتیژییە بوو لەنێو پەیڕەوانی ئایینی مەسیحیدا سەریهەڵدابوو «لە راستیدا پرسیاری گرنگو بنەڕەتی ئەوەیە ئایا بێ باوەڕی و كوفر خراپتر و دزێوترن لە ناچاركردنی كافران و یان ئەوانەی بە جۆرێكی جیاواز بیردەكەنەوە؟ كەنیسەی مەسیحی وەڵامی ئەم پرسیارانە بەشێوەیەكی ئەرێنی دەداتەوە و لەوبروایەدایە گوناهی كوفر و بێ باوەڕی زۆر لە كردەوەی زۆر و ناچاركردن لەسەر مرۆڤەكان

خراپترە، لەبەرئەوە دەبێت خوانەناس و کافرەکان بە زۆر و ناچارکردن بۆسەر ڕێگای راستی ڕێنمایی بکرێن، لە روانگەی کەنیسەوە وازهێنان لە نەیاران لە دۆخی گوناهدا خۆی بەستەمێك دادەنرا کە لەونەیارانە دەکرێت، کەواتە سەرکوتکردن بە هۆکاری ئازادکردنیان دادەنرێت لەبەرامبەر ئەشکەنجەی هەتاهەتایی»(59). شێوازی ناچارکردن بۆ باوەڕ، زۆرجار بە بەکارهێنانی توندوتیژی و هێز بووە، لەبەرامبەردا روبەڕووی بەرگری لە خۆکردنو هەڵگیرساندنی جەنگ دەبونەوە و کارەسات و کاولکاری گەورەی لێدەکەوتەوە.

جەنگی خاچ پەرستەکان ناوێکی دیارە لە مێژووی ئەوروپاو جەنگی ئاینیدا، «ساڵی(1095) پاپا (ئوربانی دووەم) جەنگی خاچ پەرستی بە ناوی خودا یەسوع و مەسیح راگەیاند، داوای لە سەربازەکان کرد هێمای خاچ لەسەر بەرگەکانیان بەئیسفنج دروستبکەن»(60)، ئەم جەنگە لەلایەن مەسیحیەکانەوە بەڕێوەچوو بۆسەر ئیسلامەکانو نامەسیحییەکان، هەروەها (ساڵی1139) کۆمەڵەی ترانی یەکەمو سەرەتای جەنگی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵـەتو حەرامکردنی بازرگانی کردن بە شتە پیرۆزەکان و چەندین مافو دەستکەوتی بەخشی بە سەربازە بەشداربووەکانی جەنگی خاچ پەرستیو مژدەی لێخۆشبونیان لەگوناهەکانیان پێدرا»، دواجار سنوری جەنگی خاچ پەرستەکان کە هەڵمەتی مەسیحییەکان بوو بۆ سەر ئیسلامەکان فراوانترو گشتگیرتر دەبێتو «لە سەردەمی پاپا ئینیوستی سێیەمدا، دەگاتە باشوری رۆژهەڵاتی فەرەنساو ئیسلامەکانی ئیسپانیا توانییان سەرکەوتووبن بەسەر موسڵمانەکاندا»(61).

ئەم جەنگە مەبەستی لەناوبردنی موسڵمانەکانی وڵاتانی ئەوروپا بوو، یاخود دەرپەراندنیان لەو وڵاتانەو بوونیان بەمەسیحی، بەڵام شێوازێکی خوێناویو ئاکامێکی تراژیدی گەورەی لێکەوتەوە، چونکە لەلایەن پاپاکانو کەنیسەکانەوە هەموو جۆرە شێوازو ڕێگەیەك رەوابوو

بۆ جەنگاوەرە خاچ پەرستەکان. هەرچەندە ئاینی مەسیحی بەئاینی خۆشەویستیو ئاشتیو پێکەوەژیان ناسراوە، بەڵام ئەمیش بەدەرنیە لەو کوشتو برو مێژووە خوێناوییەی ئاینەکانی تری پێداتێپەڕیون.

ریفۆرمی ئایینی کە مارتن لۆسەر بانگەشەی بۆدەکرد، بوەهۆی هەڵایسانی جەنگێکی خوێناوی لەسەرانسەری ئەوروپادا، چونکە ئەو ریفۆرمە بە ئاڕاستەی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی پاپاو کەنیسەو قەشەکانی دەکردو کاریدەکرد بۆ ئەوەی کە چیتر کەنیسە بازرگانی بەدینو کتێبی پیرۆز و ئایندەی ئەو دنیاوە نەکەن «هەموو ئەو شەڕو شۆڕو کوشتارەی لەو قۆناغەدا لەنێوان هەوادارانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی کڵێسەی کاسۆلیکیدا رویانداو گەلانی ئەوروپایان شەلاڵی خوێن کرد، لە واقیعدا شەڕنەبوون لەنێوان دوو مەزهەبی عیسایی جیاوازدا، شەڕبوون لەنێوان چینێکی پشتبەستوو بە کڵێسەی کاسۆلیکی، لەبەرامبەر چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتوودا، شەڕبوون لە فۆڕمی ئایندا، بەڵام ناوەرۆکیان گوزارشتبوو لە ئامانجی دووچینی کۆمەڵایەتی، یەکەمیان لەپێناو پاراستنو درێژەدان بە دەسەڵاتی خۆی، دووەم دەیویست بوونی خۆی وەك هێزێکی نوێی کۆمەڵایەتی بسەلمێنێت و دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت و سیستمێکی سیاسی دابمەزرێنێت هاوتای مەوقعی ئابوریی بێت»(62). بەمپێیە گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن پەیڕەوانی مەزهەبە جیاوازەکانی نێو ئاینێکی دیاریکراوی مەسیحی، سەرچاوە و هۆکارێکی کاراو بەردەوامی دروستبونو بەرپابوونی جەنگ بووە. ئەگەرچی هەوڵدراوە لەڕێی ریفۆرمو چاکسازی ئاینییەوە رێگە لەو دەستوەردانە گشتگیر و بەردەوامانەی کەنیسەو پادشاو پاپاکان بگیرێتو ئاین تەنها وەك پەیوەندییەکی نێوان تاکەکەسو خودا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، «بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی کە یەکێك بوو لە دەرهاویشتەکانی سەردەمی رێنیسانس، دەبوو لەناو ئەم پرۆسە مەزنەدا پێگەی خۆی

دیاری بکات. ڕێبەرانی بزوتنەوەکە هەر زوو هەستیانکرد بەبێ پاڵپشتێکی بەهێزی سیاسی و سەربازی مەحاڵە، بزوتنەوەکەیان سەرکەوتن بەدەستبهێنێت». بەکاربهێنانی هێز بەتایبەتی هێزی سەربازی مەرجێکی سەرەکی بوو بۆ سەرکەوتنی ئەنجامەکانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی، هەرچەندە سەرەئەنجام چاکسازی ئاینی لەنێو ئاینی مەسیحیدا بەسەرهەڵدانو دروستبونی مەزهەبێکی تر لەئاینی مەسیحیدا کۆتاییهات بە ناوی (پرۆتستانت) و فۆرم و پێکهاتەی دەسەڵات گۆڕانی بنەرەتی بەسەرداهات کە ئەوەش ئامانجێکی تری ریفۆرمی ئاینی بوو، «دەبینین دەرەنجامی پشتگیریکردنی دەسەڵات و بزوتنەوەکە لە یەکدی، لەلایەك بزوتنەوەکە شکڵێکی سەربەخۆی وەرگرت کە بە پرۆتستانت ناسراوە، لەلایەکی ترەوە دەسەڵات چووە فۆڕمی دەوڵەتی رەهای پاشایەتییەوە»(63).

لەنێو ئایینی جولەکەشدا بەهەمانشێوە جەنگ بوونی هەبوە و تائێستا درێژەی هەیە، بەپێی (یاساکانی دژی ناجولەکە) چەند رێگەیەك دیاریکراون، وەك چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەنجامدەرانی جەنگدا، لێرەدا ئاماژە بەو خاڵەدەکەین کە باس لەو جەنگەو ئاکامی ئەو جەنگە دەکات کە لە نێوان جولەکەیەك و ناجولەکەیەکدا بەرپادەبێت و ئاکامەکەی بەوەدەگات، ئەگەر جولەکەیەك کەسێکی ناجولەکە بکوژێت، تەنها دەبێتە سەرەتای غوربەتو دەرچون لەدیاربوون «ئەو جولەکەیەی کەسێکی نامۆ بکوژێت تەنها تۆمەتبارە بە هەڵەی دژی شەریعەت، ئەم تاوانەش قابیلی ئەوە نییە دادگا بڕیاری سزادانی بدات، بەڵام تێوەگلان لەوجۆرە تاوانە بە ناڕاستەوخۆیی بە هیچ جۆرێك گوناە نیە»(64). بەپێی ئەو دەقەی نێو کتێبی حاشاك کە کتێبێکی پیرۆزی پەیڕەوانی ئاینی جولەکەیە، هەرجۆرە جەنگێك لە دژی ناجولەکەکان جەنگێکی رەواو رێگە پێدراوە، گەر راستەوخۆ کەسێك لەو جەنگەدا بەشداربێت تەنها بەهەڵەکردن بۆی دەدرێتە قەڵەم، گەر ناڕاستەوخۆش

بەشداریکرد، ئەوا بەهیچ جۆرێك بە تاوان بۆی نادرێتە قەڵەم، ئەمەش هانی توندڕەوانی ئەم پەیڕەوە دەدات بۆ کوشتن‌و توندوتیژی بەرامبەر بەوکەسانەی کە جیاوازن لە ئایینی جولەکە، یاخود بەهەمانشێوە لە ململانێدان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی خۆیان، ئەوە دەبێتە هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگێکی تری ئایینی بەناو و فۆڕم و شێوازی جیاوازتر.

کەمینە ئاینییەکان زیاتر لە ئایینەکانی تر توشی چەوساندنەوە و لەناوچون بونەتەوە، ئیتر لە ئاکامی جەنگدا بوبێت، یاخود هەرجۆرە پرۆسەو کردەوەیەکی تر، رێدەکەوێت ئەو کەمینە ئاینیانە لە لایەن کەمینەیەکی نەتەوەییشەوە پەیڕە و دەکرێت، ئەمە ئایینەکە زیاتر لاوازدەکات‌و لە لەناوچون نزیك دەکاتەوە، «ئایینی ئێزیدی یەکێکە لە ئایینە کۆنەکانی کوردستان‌و مێژووی ئەو ئایینە بۆ زیاتر لە سێ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە، لە رووی ئاینییەوە نزیکیەکی بەرچاو لەنێوان ئایینە یارسانییەکان‌و عەلەوییەکان‌و ئایینی ئێزیدی بەرچاودەکەوێت. پێدەچێت ئەم نزیکییە هی ئەو سەردەمانەبێت کە هێشتا ئایینە ئاسمانییە جیهانییەکان (جولەکە، مەسیحی، ئیسلام) باڵیان بەسەر بیروباوەڕە ئاینییەکانی کوردستان نەکێشابێت.

لێکۆڵینەوە مێژووییەکان ئەوەنیشاندەدەن ژمارەی ئێزیدییەکان لەسەدەکانی کۆن‌و ناوەڕاست زۆر لە ئێستا زیاتربووە. گوشاری بەردەوامی ئاینی مەسیحی‌و ئیسلام بۆسەر ئەوئاینە، بەتایبەتی گوشاری عوسمانییە موسڵمانەکان ژمارەی ئەم کەمینە ئاینییەیان لەکوردستان کەمکردو پێگەی بڵاوبونەوەیانی بەرتەسککرد»(65). رەنگە ئاینی ئێزیدی گەر ئاینی نەتەوەیەکی باڵادەست‌و زلهێز بوایە زیاتر گەشەی بکردایەو بیتوانیایە بەرگری لەمانەوەی خۆی بکات، بەڵام ئێزدی زیاتر لەلایەن بەشێك لەکوردەکانەوە پەیڕەودەکرێن‌و کورد خۆی نەتەوەیەکی ژێردەست‌و چەوساوەبووە، بۆیە نەیتوانیووە بەرگری لەمانەوەی ئایینی کەمینەیەکی نەتەوەکەی بکات.

**•هۆکاری نەتەوەیی :**

پێکەوە هەڵنەکردنی چەند نەتەوەیەك لەیەك سنوری جوگرافی دەستکرد و جیاوازی داب و نەریت و هەستی ناسیۆنالیستی جەنگ بەرپادەکات، لەوجەنگانە کە مێژووی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیووە، هۆکارەکەی کێشەو بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکان بووە، «پاش شۆڕشی فەرەنسیو لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا، ئەوروپا چەند جەنگێکی یەك بە دوایەکی بەخۆیەوەبینیو تاکە دەوڵەتێکی ئەوروپایی نەما لەم جەنگانەوە نەگلێت. ئەو شەڕانەی شۆڕش لەدوو دەیەی سەرەتای تەمەنیدا ئەنجامیاندان، بۆ بەرگیکردن بوو لەخۆیو هەوڵێك بوو دژ بەهێرش و پەلاماری پادشاکانی ئەوروپا کە دەیانویست سەرلەنوێ سیستمی پاشایەتی بگێڕنەوە بۆ فەرەنساو بیروباوەڕی شۆڕش لەناوبەرن. هەرچی ئەو شەڕانەشە کە دواتر (ناپلیۆن)ی ئیمپڕاتۆر ئەنجامیدان، بە مەبەستی فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی حوکمڕانی خۆی و کێشانی نەخشەیەکی نوێ بوو بۆ ئەوروپا، نەخشەیەك تەواو جیاواز لەوەی پێشتر لەئارادا بوو «(66).

سەدەی هەژدەو دواتر بەسەرەتاکانی دروستبوونو سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی دادەنرێت، هەستی نەتەوەییو ناسیۆنالیزم لەترۆپکی گەشەسەندندابوو، خەڵکی ئەو سەردەمە ئامادەبوو بجەنگێتو بەرگری لەمانەوەی کیانو دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی بکات، لەبەرامبەر هێرشی کەنیسەو دەسەڵاتی پاپاو پادشاو قەشەکاندا.

پێکەوەهەڵنەکردنی نەتەوە جیاوازەکان لەسنوری وڵاتێکی دیاریکراودا، یاخود دەوڵەتە نەتەوەییە جیاوازەکان پێکەوە هۆکارێکی تری بەرپابوونی جەنگن، «بەڵام بەشێوەیەکی گشتی، چەند دەوڵەت لە کەمترین رەگەز پێکبێت، ئەوەندە گیروگرفتی کەمتردەبێت، لەسەر ئەم بنچینەیەدا، دەوڵەتە تاك نەتەوەکان هەمیشە لە دەوڵەتە فرەنەتەوەکان ئارامتر و کەم گیروگرفت ترن»(67).

دەکرێت لەم سۆنگەیەوە بەچارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەکانو دروستکردنی کیانی نەتەوەیی بۆ نەتەوەکان، ڕێگری بکرێت لەبەردەم ئەو جەنگەدا کە هۆکاری نەتەوەی زەمینەی سەرهەڵدانو بەرپا بونیەتی.

فرەنەتەوەیی لە وڵاتێکی خاوەن پیشەسازی گەورەدا هیچ جۆرە کێشەیەك نیە، بەڵام بە پێچەوانەوە لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا لە رووی پیشەسازییەوە، بوونی کەمترین نەتەوە کێشەو ناکۆکیو جەنگ بەرپا دەکات، «ئەگەرچی لەم بارەیەوە هیچ دەستورێکی گشتیو نەگۆڕ لە ئارادا نییە، بەڵام دەکرێت بوترێت کە چەند دەوڵەتی فرەنەتەوە لە رووی پیشەسازی و کۆمەڵایەتییەوە پێشکەوتووبێت ئەوەندە گیروگرفتە رەگەزییەکانی کەمتر دەبن و چەند دواکەوتوبێت ئەوەندە بە دەست گیروگرفتی رەگەزەکان دەناڵێنێت»(68).

**باسی سێهەم-جۆرەکانی جەنگ:**

لەگەڵ تێپەڕینی سەردەمەکاندا جۆرو پێکهاتەی جەنگ گۆڕانکاری بەردەوامی بەسەرداهاتووە، بەهەمانشێوە ئاکام و کاریگەریەکانی جەنگ گۆڕانی بەسەرداهاتووە. لەبەرئەوە دەکرێت جۆرەکانی جەنگ دابەشبکرێت بۆ:

**یەکەم-جەنگی سەربازیو پێکدادان:**

لەم جەنگەدا جۆرەکانی چەك و تەقەمەنی و تەکنیکی سەربازیو جەنگاوەر بەشداریدەکەنو رووبەڕو لە مەیدانی جەنگەکاندا لایەنە شەڕکەرەکان پێکدادەدەن، سەرەڕای جەختکردنەوە لە پاڵپشتیکردن بەسەرچاوەی ئابوریو سیاسیو تەکنەلۆژیا، بەڵام کارای سەرەکیو کاریگەر لەمجۆرە جەنگەدا رووبەروبونەوە و هەڵکوتانە سەرخاڵ و بنکەکانی بەرامبەر و هەوڵدان بۆ تێکشکاندنیان بە یارمەتی چەكو تەقەمەنیو فڕۆکەو تەکنەلۆژیا جەنگییەکانی تر، دەکرێت ئەم جەنگە دابەشبکرێت بۆ چەند بەشێکی تر:

**جەنگی وشکانی :**

لەم جەنگەدا تانك‌و زرێپۆش‌و سەربازو ئامرازە زەمینییەکانی جەنگ بەکاردەهێنرێت، ئامانجیان دەستبەسەرداگرتن، یاخود داگیرکردنی زەمین‌و شوێنە گرنگەکان‌و راستەوخۆ لەگەڵ بەرامبەردا توشی بەریەککەوتن‌و پێکدادان دەبنەوە. «کە زیاتر پشتدەبەستێت بە چەند بنەمایەك وەك پێگە، هێڵەکانی گواستنەوە، بڵاوکردنەوەی هێز»(69). واتە دەستبەسەرداگرتنی بنکەو پێگە هەستیار و گرنگەکان، دەتوانن رۆڵیان لە ئاکامی جەنگەکەدا هەبێت، هەروەها هەوڵدان بۆ لێکدابڕان‌و داگیرکردنی هێڵەکانی گواستنەوە و بە یەکگەیشتنی ناوچە جیاوازەکان، چونکە گواستنەوە گرنگترین کاراکتەرە لە ستراتیژی سیاسی‌و سەربازیدا، دەکرێت لە رێی ئەو هێڵانەوە ناوچەکان لە یەکتری دابڕدرێن، ئەمەش هۆکارێکە بۆ سەرکەوتن بە پشتبەستنی تەواو لە ژێری‌و چۆنیەتی بڵاوەپێکردن‌و دابەشکردنی هێزە سەربازییەکاندا. «بەهای ستراتیژی پێگە بە تەنیا پەیوەندی پێگەکە بە هێڵە ستراتیژییەکانەوە نییە، بەڵکو بەو سەرمایانەوە کە لەو ناوچەیەدا بونیان هەیە، یان بەهەمان ناوچەی پێکەوە بەستراوەوە»(70). بەم پێیە ئەو سامانە سروشتی‌و پێکهاتە جیاوازانەی لەو ناوچەیەدا بونیان هەیە، دەکەونە نزیك پێگەی دیاریکراو، ئاکام‌و ئاڕاستەی جەنگە زەمینیەکە بە ئاقاری سەرکەوتندا دەڕوات. هۆکارو بەربەستی جوگرافی‌و جیۆپۆلەتیکی رۆلێکی سەرەکی دەبینێت لە یەکلاییکردنەوەی ئاکامەکانی جەنگی وشکانی، «هەڵبەتە بەربەستە جوگرافیەکان‌و گرانی پێگەیشتنی هاوکاری، رێگربوون لەبەردەم پێشکەوتن‌و چونەپێشی هێزە سەربازییەکاندا لە رابردوودا، بەڵام پلە بەپلە بەرەو کەمبونەوە دەچێت بەهۆی فەراهەمبوونی ئاسانی جوڵەو گواستنەوە، کە هۆکارەکانی تەکنەلۆژیای نوێ بۆ هێزە سەربازیەکانی دابینکردووە(71).

تەکنەلۆژیاو ئاسانبوونی هۆکارەکانی گواستنەوە، رۆڵی هەبووە لە پێشکەوتن‌و بە گرنگی هێشتنەوەی جەنگە زەمینییەکان‌و کاریگەربوونی ئەنجامەکانی ئەمجۆرە جەنگە.

**جەنگی دەریایی :**

بە هۆی گرنگی دەریاوانی‌و کورتکردنەوەی رێگاو گواستنەوەی سەربازو هۆکارو پێداویستییە جەنگیەکان، وڵاتانی بەجەنگهاتوو بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکی‌و ململانێکانیان پەنادەبەن بۆ بەکارهێنانی جەنگی دەریـایـی، کە لەنێو دەریـــاداو لەسەر پشتی کەشتیی‌و ژێردەریاییەکان جەنگ ئەنجامدەدەن. «جەنگی دەریایی لەبەشێکی زۆریدا جەختدەکاتە سەر پەیوەستبوون بە خاڵەکانی کۆنترۆڵکردن- Choke Points، لە بواری کەشتیگەلی‌و دەریاوانیدا»(72). کۆنترۆڵکردنی خاڵە هەستیارو گرنگەکانی نێوبواری کەشتیگەلی‌و دەریاوانی دەتوانێت گرەنتی سەرکەوتنی بەشێکی زۆری جەنگ لەنێو دەریـادا مسۆگەر بکات، «زانایانی بواری گەمارۆ، پێیانوایە بۆ بەندەرو نۆکەندە ئاوییەکانی بەرامبەر، دابڕین‌و پچڕاندنی هێڵەکانی گواستنەوەی دەریایی، لەمیانەی کۆنترۆڵکردنی رێڕەوە ئاوییەکانەوە، زۆرترین گریمانەی سەرکەوتنی جەنگە دەرياییەکان دەسەلمێنێت»(73).

لەنێو جەنگی دەریـاو کەشتیگەلە سەربازییەکاندا چەند دەروازە و خاڵێکی گرنگ‌و کاریگەر هەیە دەتوانێت رۆڵی هەبێت لەسەرکەوتنی جەنگدا، بۆیە دەبێت سەربازو کەشتییە جەنگیەکان‌و سەرکردەو دەریاوانە بڕیار بەدەستەکان هەوڵبدەن بۆ کۆنترۆڵکردن‌و داگیرکردنیان، چونکە دەتوانن بەوهۆیەوە لەلایەك سەرچاوەیەکی سەرکەوتن مسۆگەربکەن، لەلایەکی تر هۆکارو دەروازەیەکی لایەنی بەرامبەرو دوژمـن تێکبشکێنن‌و هەردەروازەیەکیان لەبەردەمدا دابخەن کەگریمانەی سەرکەوتنیان پێبدات.

«هەوڵبدە خۆت لە رووبەڕوبونەوەی سوپای کشاو لابدەیت، کاتێك ئەو لەسەر رۆخی روبار یان دەریابێت...چاکتروایە لێبگەڕێیت دوژمن خەریکی پەڕینەوەبێت...ئەوسا لەنێوەندی روبارەکەدا دەستبکە بە لێدانی»(74). ئەمە ئامۆژگاری سەرکردەیەکی سەربازی بە ئەزمونە کە گریمانەی سەرکەوتنی جەنگ لە دەریاو روبارەکاندا دەکات.

**جەنگی ئاسمانی :**

کارەکتەری چـالاك لەمجۆرە جەنگەدا فڕۆکەیە، مێژووی جەنگەکانو ئاکامەکانیان ئەو راستییەیان سەلماندووە کە جەنگی ئاسمانی هەردەم (بەشی شێر)یان بەرکەوتووە لە سەرکەوتنو یەکلایی کردنەوەی ئاکامەکانی جەنگدا، چونکە هەمیشە فڕۆکە جەنگییەکان بەتواناتربوون لەهێزە سەربازییە پیادە و دەریاییەکان، بەوەی کە لەتوانادا بەهێزترو لەخێرایدا خێراترن، دەتوانن کاریگەرانەتر و وردتر ئامانج و بنکەکانی دوژمن و لایەنی بەرامبەر بپێکن، هەروەها فڕۆکە سەربازییەکان دەتوانن بێهیچ زیانێك یاخود زیانێکی کەمتر فریاگوزاری تەندروستیو گەیاندنی پێداویستیو کۆمەکی سەربازی بەشداری بکەن لە جەنگداو سەرکەوتن بکەنە راستیو بەرجەستە. «ناتوانرێت بە وردی باس لە تیۆری هێزی ئاسمانی بکرێت، تەنها لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا نەبێت، ئاشکرایە هەر دیالۆگو گفتوگۆیەك سەبارەت بەهێزی ئاسمانی ئەنجامبدرێت، پێویستە ئەو راستییە پەسندبکرێت کە فڕۆکە راستییەکی بەرجەستەیە، هەروەها قسەکردن لەسەر جۆرو توانای فڕۆکە دەبێتە راستییەکی حاشاهەڵنەگری تر»(75).

هەرچەندە قسەکردن لەسەر بوونو کاریگەریو توانای فڕۆکە لە هێزی سەربازیو مەیدانی جەنگدا، تەنها وەك خەیاڵو کارەکتەری چیرۆك مامەڵەی لەگەڵدا دەکـرا. «نوسەرە سەرەتاکان ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر تەکنیكو کاروباری ئاسمانی لەلایەنی سەربازیدا

نوسیووه، له ماوەی نێوان دروستبوونو سەرەتای دەستکەوتنی فڕۆکە لەلایەن هێزی سەربازیو جەنگی وڵاتە گەورەکان لە ساڵی (1909)، تاسەرهەڵدانی (جەنگی جیهانی یەکەم1914-1918) ئەو نوسەرانە وەك چیرۆکنوسەکان خـەونو خەیاڵو فەنتازیایان وێنەدەکێشا، دەکرێت نوسینی هەندێك لەونوسەرانە بەنمونە وەربگیرێت»(76).

هەرچۆنێك بێت لەم جەنگەدا شوێنەواری کاولکاریو کوشتارو دارِمانی ژێرخانی ئابوریو کۆمەڵایەتی دەکەوێتەوە و مەترسی گەورە لەبەرامبەر ئایندەی مرۆڤایەتیدا پەیدا دەکات.

**دووهەم-جەنگی تەکنەلۆژیا و ئەتۆم:**

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژیا لە وڵاتانی جیهاندا لەلایەن مرۆڤەوە، هاوکات جەنگو تەکنەلۆژیا جەنگیەکانیش گۆڕانیان بەسەردادێت و پێشکەوتن بەخۆیانەوە دەبینن، بەجۆرێك ئەو گۆڕانکاریو پێشکەوتنە کاریگەری لەسەر ئاکامی جەنگو ئاڕاستەی جەنگە یەك لە دوای یەکەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دروستکردووە. دیارترین دروستبوونی چەکی ئەتۆمیو تەکنەلۆژیا هەستیارو کاریگەرەکانی تری بواری سەربازیو جەنگە.

«شتێکی چاوەڕوانکراوە لەداهاتوودا، چەکی نوێتر دابهێنرێت وەك: کۆمەڵکوژ، نمونەش لەمبارەیەوە توانای کۆنترۆڵکردنی هێزی سروشتی وەك بومەلەرزە و تەقینەوەی بورکانەکان و رۆچونی زەوی تاببێتە هێزێکی وێرانکار، ئاڕاستەبکرێت بۆ وێرانکردنو لەناوبردنی رەگەزی مرۆڤایەتی لەسەر رووی زەویدا»(77). چەندە مرۆڤایەتیو زانستو تەکنەلۆژیا بەرەوپێشەوە بچێت، هەروەها داهێنانو بەرهەمە تەکنەلۆژییەکان گەشە بکات و پەرەبسێنێت، هێندەش ئەگەری لەناوچونی مرۆڤایەتی نزیکتردەبێتەوە و ئەگەری سەرهەڵدانی جەنگی گەورە و کاولکاری گەورە دەبێتە شتێکی بەرجەستە و راستەقینە.

«کۆمەڵێك گۆڕانکاری گـەورە لە بـواری تایبەتمەندی چەكو پێداویستییە جەنگییەکانی تردا روویـانـداوە، کە لەماوەی پەنجا ساڵی رابردوودا، لەسەرو هەموو پێشبینییەکانەوە بووە، لە تازەترین و گرنگترین گۆڕانکارییدا بە پلەی یەکەم زیادەیی لە وردەکـای ئاڕاستەکردندا، بە بەکارهێنانی ئەلکترۆنیی هەستیار، لەخۆگرتنی کەلوپەلی نایاب وەك سوتەمەنی بزوێنەرەکان، پلێتەکانی خۆپارێزیو نوێترین رێوشوێنی دژە ئاشکرابوونی وەنـەوشـەیـیو پەخشی ئەلکترۆنی، هەروەها داهێنانی سیستمی چەکی پێشکەوتووی نایاب، بە ئاسانی بەکارهێنانو بچوکیو سوکی لەقەبارە و کێشدا، گەشەسەندنە تەکنەلۆژیایەکان تەواوی کارەکانی جەنگ لە مەیدانی چالاکییە سەربازییەکاندا لەخۆدەگرێت، لەکۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئامانجەکانی بەرامبەرو بەڕێوەبردنی چۆنیەتی ئاڕاستەکردنی موشەکەکانو دیاریکردنی زیانو بەرکەوتەکانی». بەتێپەڕینی رۆژگار داهێنانە زانستیو تەکنەلۆژییەکان زیاتر گەشەدەکەنو هەستیارترو کاریگەرتر دەبـن، هەڵبەت بـواری تەکنەلۆژیای جەنگیش بەشی لەوپێشکەوتنو داهێنانانە بەردەکەوێت، زۆرینەی وڵاتان بە تایبەتی وڵاتە خاوەن ئابووریو پیشەسازییە گەورەکان، رێژەیەکی زۆر لەداهاتی ساڵانەی نیشتیمانی خۆیان بۆ بواری لێکۆڵینەوەی زانستی تەرخاندەکەن، بە مەبەستی گەیشتنو دۆزینەوەی داهێنانی نوێو بەهێزو کاریگەر لە بواری تەکنەلۆژیادا بە گشتیو تەکنەلۆژیای سەربازی بەتایبەتی، بۆنمونە «کۆی ئەوداهاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەرخانی کردووە بۆ توێژینەوەو گەشەپێدانی جەنگ، لە 10 ساڵی کۆتاییدا، بریتیە لە (130) بلیۆن دۆلار، بە زیادبونی (40) بلیۆن دۆلاری تر کەتەرخانیکردووە بۆ توێژینەوە لەبواری بۆشایی ئاسماندا و بەشێکی گرنگو گەورەی بواری سەربازیو جەنگیی لێبەرهەمدێت، بە بەراورد بە تەرخانکردنی بڕی تەنها (85) بلیۆن دۆلار بۆ بواری توێژینەوەی

زانستی مەدەنی(78). بۆیە دەبێت پێشبینی دروستبوونو هێنانەکایەی چەندین داهێنانی جۆرە چەكو تەکنەلۆژیای جەنگیو سەربازی گەورە بکرێت کە لەلایەن وڵاتێکی گەورەو خاوەن ئابوریو پیشەسازی پێشکەوتوی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە دروستبکرێت و بەکاربێت لەجەنگەکانی ئێستاو ئایندەدا.

لە جەنگی تەکنەلۆژیادا لایەنەکان جەنگ لەگەڵ یەکتر و نمایش دەکەن، وەك ئێستا زۆرینەی وڵاتان باس لەتەکنەلۆژیا هەواڵگرییەکانو کڵاوە ئەتۆمییەکان دەکەن، کە گەورەترین هەڕەشەو مەترسییە بۆ سەرئاسایشی جیهانو ئایندەی مرۆڤایەتی، «ناکرێت پێشبینی ئاکامی سنورەکانی وێرانکاری کڵاوە ئەتۆمییەکی بیست میگاتەنی بکرێت، بەڵام ئەوەندە بەسە پێشبینی ئەوەبکرێت کۆی ئەو وێرانکاریانەی بەهۆی تەقینەوەکانەوە رەگـەزی مرۆڤایەتی بەکاریانهێناوە لە جەنگەکاندا لە تەواوی مێژوودا نەگەیشتۆتە بیست میگاتەن تاکو ئێستا»(79). گەر کۆی ئەو هەموو تەقەمەنییەی لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە تائەمڕۆ بەکارهاتووە و ئەو هەموو کارەساتە گەورانەی لێکەوتۆتەوە و ملیارەها لە مرۆڤی لەناوبردووە، نەگەیشتبێتە بیست میگاتەن کە کۆی ئاکامەکانی بەکارهێنانی کڵاوەیەکی ئەتۆمییە، ئاخۆ بەبەکارهێنانو تەقاندنی ئەو هەموو کڵاوە ئەتۆمیە کە وڵاتان خاوەنیین، دەبێت گۆی زەویو مرۆڤایەتی چی لێبەسەربێت؟.

**سێهەم-جەنگی ئەلکترۆنی:**

زانستو تەکنەلۆژیا چەندین بواری جیاواز لە روخسارو پێکهاتە نزیك لە وردەکاریدا لەخۆدەگرێت، ئامێرە تەکنیکیەکانی وەك رادارو بێسیمو ئاڕاستەکاری موشەکەکان لەو ئامێرە تەکنیەکیانەن لە جەنگ و بواری سەربازیدا بەکاردەهێنرێنو سودیان لێوەردەگیرێت. «جەنگی ئەلکترۆنی بریتییە لەوبەشەی سەربازیی، کە ئامێری ئەلکترۆنی بەکاردەهێنن

بۆ گرنگی پێدان بەو رێوشوێنانەی دەگیرێنەبەر بۆ رێگرتن یان کەمکردنەوەی بەکارهێنانی توانای کەهرۆموگناتیسی لەلایەن دوژمنەوە بە چالاکی، پارێزگاریکردن لەسەرچاوە و وزە کەهرۆموگناتیسییە نێردراوە چالاکەکانی خۆی»(80). دەتوانرێت سود لە جەنگی ئەلکترۆنی وەربگیرێت بۆ شکستهێنانی هەوڵو هێرشی بەرامبەر کە بیەوێت زیان بە ئامێرو تەکنەلۆژیاو کەلوپەلەکان بگەیەنێت.

«جەنگی ئەلکترۆنی بەکارهێنانی ئامێرو تەکنیکی ئەلکترۆنییە بۆدیاریکردنی بونی هاوکاری ئەلکترۆنی، تێکشکاندنی هاوکاری ئەلکترۆنی بەرامبەر، رێگرتن لە شکستهێنانی هاوکاری ئەلکترۆنی»( 81). بە پشتبەستن بە ئامێرە بەکارهاتووەکان لە جەنگی ئەلکترۆنیدا، دەتوانرێت گرەنتی تەندروستیو سەلامەتی سەربازو سەرکەوتنی ئاکامی جەنگەکە بکرێت، بەوەی لەلایەك دەستەبەری گەیشتنی هاوکارییەکان دەکات، لەلایەکی ترەوە هەوڵو هێرشەکانی بەرامبەر تێکدەشکێنێت، یاخود بەوردی ئاشکرای دەکات. «یەکەم چالاکی لەبواری جەنگی ئەلکترۆنیدا دەگەڕێتەوە بۆساڵی (1905) لەکاتی جەنگی نێوان روسیاو یابان لەجەنگی (توشیما-Tsushima)دا، کاتێك کەشتییە هەواڵگرییەکانی یابان چاودێری کەشتیگەلەکانی روسیایان دەکرد و زانیاریەکانیان دەگواستەوە بۆ کەشتیگەلی سەرکردایەتی سەربازی یابانی، کاتێك فەرماندەیەکی دەریایی روسیا یەکێك لەوبروسکانەی دەستکەوتو داوای مۆڵەتیکرد بۆ بەکارهێنانی دژەپەخش بۆ وەستاندنی چالاکی زانیاری ناردنی یابانییەکان، بەڵام نەیتوانی سەرکردەکانی خۆی بەوداوایە قایلبکات»(82). کەواتە هەرچەندە ئەم جەنگە مێژووەکەی نزیکەی سەدەیەك دەبێت، بەڵام تواناو کاریگەریو دەرەنجامەکانی زۆر بەئاشکرا دەردەکەوێت، بەتایبەتی لە ئاشکراکردنی نهێنییەکانو گواستنەوەی خێرای زانیاریو بەڵگەنامە پێویستەکان.

**چوارەم- جەنگی کیمیاوی‌و بایۆلۆژی:**

هەرچەندە لە مێژووی مرۆڤایەتی زۆرێك لەجەنگەکان بەتەواوی چەکی بایۆلۆژی بەکارنەهاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا هەندێك وڵات یان رژێمی سیاسی کیمیاویان لەپێناو لەناوبردنی بەرانبەردا بەکارهێناوە، هاوکات دەبێت بوترێت لەمێژە سوود لەمیکرۆب وەرگیراوە بۆ زیانگەیاندن بە دوژمن، وەك فڕێدانی لاشەی مردوو بۆ ناوچەی گەمارۆدراو یان پیسکردنی بیرو سەرچاوەکانی ئاو، یاخود بڵاوکردنەوەی نەخۆشی و ڤایرۆس و میکرۆب.

«چەکی بایۆلۆژی بۆمەبەستی قەڵاچۆکردنی یەکسەری دوژمن سوودی لێوەردەگیرێت، یان بۆ کەمکردنەوەی سەرچاوەی خواردەمەنییان، رێگەی سەرەکی بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆژی بریتییە لە پەیداکردنی هەورێك یان دوکەڵێکی پێکهاتوو لە پارچونکەی وردیلەی هەوایی‌و مانەوەی لە هەوادا، هەتا هەناسەی تێدابدرێت، یان بەرپێست بکەوێت‌و بچێتە لەشی خەڵکی ناوچەکە»(83).

کوشندەیی‌و کاریگەری چەکی بایۆلۆژی وەك چەکی کیمیاوی گەر لەبەرامبەر یەکتریدا بەراوردبکرێن، دەکرێت بڵێین رادەو جۆری کارتێکردن‌و بەرکەوتنەکە دەکەوێتەسەر توانای بەرگری کەسی بەرکەوتوو بە چەك‌و ڤایرۆسە بایۆلۆژی یان کیمیاوییەکە کە لەجەنگدا بەکاردەهێنرێت، بە جۆرێك جیاوازی بەرکەوتنەکە، دەبێتە هۆکاری جیاوازبوون لەتووشبوون‌و کارتێکردندا، پێویستە ئاماژە بە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم مادانە بکرێت لە جەنگدا، بەوەی «ئەم ماددانە لەشێوەی رەق یان نیمچە رەقدا بەکاردێن‌و لەکاتی تەقینەوەی بۆمبادا بڵاودەبنەوە، بەشێوەی پارچەی وردی هەوایی‌و پاش چونە لەشی ئادەمیزادەوە دەبنەهۆی نەخۆشی، ئەومیکرۆبانە لە لەشی ئادەمیزادا بە خێرایی زاوزێ دەکەن لەبەرئەوەی دەتوانن یەکجار کاریگەربن لەزیان بەخشیندا، تەنانەت لە چڕییەکی زۆرکەمیشدا ئەوماددانە دەتوانن ناوچەیەکی فراوان پیسبکەن»(84).

هەستیاری و کاریگەری ئەومادەیە بە جۆرێکە کە لەکەمترین کاتدا لەفراوانترین پانتایی جوگرافیدا و لە زۆرترین جەستەی بەرکەوتوودا، کاریگەری خۆی بەجێدەهێڵێت و دەتوانێت ئامانجەکانی خۆی بپێکێت و ئەرکەکانی جێبەجێ بکات.

**پێنجەم-جەنگی ناوخۆییو ئەهلی:**

بە گەڕانەوە بۆ مێژووی زۆرینەی وڵاتان و کیشوەرە جیاوازەکان، بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە جەنگی ناوخۆیی یاخود جەنگی گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووەکەیان، زۆرجار ئەو جەنگە خۆی لەبازنەی شۆڕش و راپەڕیندا خۆی دەبینێتەوە. لەکاتێکی وادا هەریەك لەگروپو کۆمەڵە جیاوازەکان خۆیان بەسەرچاوەی راستیو بەرامبەریشیان بەهەڵەو سەرچاوەی ئاژاوەو مەترسییان دەناساند، «بۆ ئەوەی پاکێتی قسە لەسەر پاکێتی خۆی بکات، دەبێت لەسەر کۆمەڵێك وێنای دیکە کاربکات، دەبێت خۆی بەشوناسنامەو جەوهەری ئەوانی دیکەشەوە سەرقاڵ بکات، چونکە لە راستیدا هەموو بێتاوانییەك لەڕێگەی بەراوردەوە بەتاوانێك دەتوانێت خۆی بەرجەستە بکات»(85). واتا گەر گروپێك توانی بێتاوانیو بێگوناهی خۆی لە بەرامبەر تاوانباریو گوناهباری گروپەکەی تردا بسەلمێنێت، بەهەمانشێوە دەتوانێت رەوایەت بە خۆی بدات کە فتوای جەنگکردن و لەناوبردنی هەمان گروپ دەربکات تاگریمانەی مانەوەی خۆی بۆ هەمیشە دابین بکات.

لەو جۆرەی کۆمەڵگەدا کە تائێستا نەیتوانیوە بەرهەمهێنەری هەستی شوناسو پابەندی هاوڵاتیبون بێت بۆ ئەندامەکانی، کە دەبێتەهۆی تێکەڵبون و بە یەکداهاتنی ئەرکە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان و دەستوەردانە کاروباری یەکتر و هەوڵدان بۆلەناوبردنی بەرامبەر، لەبەر سودی تایبەتی و بەرژەوەندییەکانی خۆیدا،لەوکۆمەڵگەیانەدا هەمیشە زەمینەسازی سەرهەڵدانی جەنگی ناوخۆیی و جەنگی گروپە جیاوازەکان

ئەگەرێکی زۆرە، «لەمجۆرە کۆمەڵگەیەدا هەموو بەرەکان باسی تاوانەکانی یەکدی دەکەن، ئەگەر سەرنج بدەینە رۆژنامەکانی ناوە و دەرەوە، یان بەیاننامەی گروپە جیاوازەکان، یان ئەنجامی کۆنگرەو کۆبونەوە بێ سوودو بێ شومارەکان- کە بۆتە شێوەیەکی ئاشکرای خۆئامادەکردنەوەی هەندێك کەسایەتی و هەندێك رۆشنبیر، کە هێندەی لەناو ترسی لەیادچونەوەی ناوی خۆیاندا دەژین- بە ئاسانی دەتوانین ببینین هەتا ئەوانەش لەدەرەوەی جەنگ و دژی جەنگ قسەدەکەن، بەهەمان یاسا کاردەکەن، کە جەنگی بەرهەمهێناوە، لکە لاوەکی و تەڵزمە شکاوەکانی هەمان هاوکێشەن، درێژکراوەی هەمان هێڵو دروستکەرەوەی هەمان ئەتمۆسفێرن»(86). واتا ئەو ئەرکەی کەسێکی بێلایەن لە ئایدیایەکی دیاریکراو لەوجۆرە کۆمەڵگە ناتەندروستانەدا بەجێیدەهێنن، هەمان ئەرکە کە کەسێکی خاوەن بەرژەوەندی ئایدۆلۆژی یان ئابوری یاخود مەزهەبی دەیبینن لەهەڵگیرساندن و بەڕێوەچوونی هەرجەنگێکدا، گەر بە جۆرێکی تر بڵێین کەلتور و نەریتی باوی ئەوجۆرانە لە کۆمەڵگە هەردەم سازو لەبارە بۆ بەرهەمهێنانی جەنگ و هۆکارە بابەتیەکانی پەیوەندیدار بە جەنگ و زەبروزەنگ.

گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگە لەململانێدان بۆ ئەوەی بەرامبەر ببەزێننو بۆخۆیان بچنە ترۆپکی دەسەڵات و پیرۆزیو بێگوناهی ببەخشن بەخۆیان، بەوهۆیەوە ئامانجو بەرژەوەندییەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن و خواستەکانیان فەراهەمبکەن، «هەمیشە جەنگ بریتی بووە لە ململانێ، کە تێدەکۆشێت بۆ تواندنەوەی بەرامبەر لەخۆیدا، بۆگەیشتن بەوئامانجە، پێویست بە بەکارهێنانی هێز و تەواوی ئامراز و هۆکارە جیاواز و گونجاوەکان دەکات»(87). بۆیە دەبێت رێ لەهەرجۆرە بیرکردنەوە و فاکتەرێکی ناوخۆییو دەرەکی بگیرێت کە هۆکار دەبێت بۆسەرهەڵدانی توندوتیژیو جەنگی ناوخۆیی لەنێو گروپە کۆمەڵایەتیو ئیتنییە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا.

**شەشەم-جەنگی ئایینی:**

ئاین یەکێکە لەوبابەتە گرنگو سەرنجڕاکێشو ئایندەگیریانەی هۆکاری خوڵقاندنی چەندین بیروبۆچونە لەنێو سۆسیۆلۆجان و بیرمەنداندا، سەبارەت بە سەرەتاو پێگەو کاریگەری ئایین، جەنگە ئاینییەکان چەندین بیروبۆچونو ئایدیای جیاواز لەبارەیانەوە پەیدابوونو لێکدانەوەی جیاوازی لەسەرە.

جەنگە ئاینییەکان زۆرجار لەنێوپەیڕەوانی خودی ئاینەکەدا لەلایەن مەزهەبە جیاوازەکانەوە روودەدات، بە تایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست،»تایبەتمەندییەکی سەدەی شانزە، بەرپابوونی جەنگە ئایینیو مەزهەبییەکان بوو، کە سەرتاسەری ئەوروپای گرتبۆوە، بۆنمونە فەرەنسا لە ماوەی نێوان ساڵەکانی (1562-1589) هەشت جەنگی ناوخۆیی ئاینی بەخۆوە بینی کە گەورەترین تاوانیان تێدا ئەنجامدرا، بەتایبەتی قەسابخانەکەی سان برتیلمی»(88). ئەوجۆرە جەنگە ئاینیانە بەشێوەیەك پەرەیان ستاندبوو، ببوە بەشێك لەناسنامەو تایبەتمەندی چەند سەدەیەکی ناوەڕاست.

ریفۆرمی ئایینی بۆ خۆی بووە بەشێك لەسەرهەڵدانی جەنگە ئاینییەکانی سەردەمەکەی، چونکە رابەرانی بزوتنەوەی چاکسازی گەیشتبونە ئـەوەی ئەستەمە بتوانن بەبێ خۆسەپاندن، پـڕۆژەو ریفۆرمەکەیان بە ئاکام بگەیەنن. «ریفۆرمی ئاینی بۆی ئاشکرابوو سەرکەوتنی مسۆگەر نابێت، گەر نەتوانێت پشتیوانی فەرمانڕەوادنیاییەکان و پاڵپشتی ئەوان لە رووی سیاسیو سەربازییەوە بە دەستبهێنێت، (مارتن لۆسەر) گەیشتە ئەو بـاوەڕەی بۆ سەرخستنی بزوتنەوەکەی لەئەڵمانیدا پێویستی بە یارمەتی میرو دەسەڵاتداران هەیە»(89). لێرەوە دەردەکەوێت جەنگە ئاینییەکان هاوتەریب لەگەڵ جەنگەکانی تردا بەشێك بوون لەهۆکاری لەناوچونی مرۆڤایەتیو کاولکاری  کە بەسەر گۆی زەویدا هاتووە و هەڕەشە لە ژیانو مرۆڤایەتیو شارستانی دەکات.

«جەنگی سی ساڵە)ی نێوان پرۆتستانت و کاسۆلیکەکان لە ناوەڕاستی ئەوروپا لەنێوان ساڵانی(1618-1648) دەردەکەوێت کە تاکو چ ئاستێك کاولکاری لێکەوتۆتەوە، بەتایبەتی لەوناوچانەی مەیدانی جەنگو کوشتاربوون، تیایدا ڕێژەی قوربانیەکانی ئەم جەنگە گەیشتە (6)ملیۆن کەس، واتە ڕێژەی (40%)ی دانیشتوانی ناوەڕاستی ئەوروپاو (65%) ی دانیشتوانی وڵاتە بە جەنگ هاتووەکان»(90). ئەو ئامارە ڕێژەی نامرۆڤایەتیو دەمارگیری رابەرانی ئەو دوو مەزهەبە جیاوازە دەردەخات کە لەپێناو بەرژەوەندی و لێکنەگەیشتنی ئاینی و مەزهەبیدا ئەو ڕێژە بەرچاوەی مرۆڤایەتیان بە کوشتداوە.

**حەوتەم -جەنگی دەروونی:**

جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی پلان بۆ پڕوپاگەندەو هاوشێوەکانی تری، لەگرتنبەری ڕێوشوێنی ئاڕاستەکراو بۆ وڵاتی دوژمن یان بێلایەن یاخود دۆست، بە ئامانجی دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر هەستو سۆزو بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتی هاوڵاتیانی ئەو وڵاتەی پڕوپاگەندەی ئاڕاستە دەکرێت، بەم هۆیەوە وڵاتی ئاڕاستەکاری پڕوپاگەندە کۆمەڵێك ئامانجی تایبەتیو دیاریکراوی خۆی دەستدەکەوێت.

جەنگی دەروونی بە تەنها ئاڕاستەی وڵاتی دوژمن یان بەرامبەر ناکرێت، بەڵکو وڵاتانی تری دۆست و بێلایەنیش دەگرێتەوە، لەبەرئەوە زانایان وشەی (پڕوپاگەندە) بە پەسندتر دەزانن لە بەرامبەر جەنگی دەروونیدا.

«جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی پلانو نەخشە لەلایەن دەوڵەت یان گروپێك، بۆ پڕوپاگەندە لەبەرامبەر وڵاتی نەیار یان دۆست یان بێلایەن، بە مەبەستی کارکردنە سەر هەستو بیرکردنەوە و بیروبۆچونەکانیان بە خاتری پاراستن و بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکە»(91).

**هەشتەم-جەنگی سارد:**

جەنگی سارد توندترینو خراپترین ئاستی ناکۆکیو ململانێی ئابوریو سیاسیو ئایدۆلۆژیو راگەیاندنەکانی نێوان هەردووبلۆکی رۆژهەڵات (سۆشیالیستی) بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێتو بلۆکی رۆژئاوا (سەرمایەداری) بەسەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە، تاسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوو درێژەی کێشاو بەشکستهێنانی بلۆکی رۆژهەڵاتو هەڵوەشانی یەکێتی سۆڤییەت کۆتاییهاتو بووە هۆی دروستبوونی چەندین دەوڵـەت. «جیهان بەهۆی جەنگی ساردەوە خاوەن شارێکی فراوانی پڕ لەترسو نامۆیی بوو، ئەو شارە پڕ لەترسە لەپڕێکدا ونبوو، ململانێی نێوان رۆژهەڵاتو رۆژئاوا کە زاڵبونێکە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە نیوەی دووەمـی سـەدەی بیستەمدا، بە هاوسەنگییەکی جیۆپۆلەتیکی شارێکی ئاسۆفراوانو مەزنو پتەو ئاشنابوو، لەکۆتایی ساڵی (1991) دا ئەوململانێیە نەما، هێڵە درێژەکانی سنوورو خزمەتی زۆری حکومەتەکانو هەموو ئەو دوژمنکاریو ئاشنایەتیەی گەلانو وڵاتانی جیهان خۆیان پێوەگرتبوو، رێکخستنی سیاسەتی دەرەوە و ناوەوەیان بۆ تەرخانکردبوو، بەسەرچوو، داڕشتنەوەو بوژاندنەوەی سەرلەنوێی رەوشەکان بەشێوەیەك پێناسکرا پێشتربوونی نەبوو، جیهان پاش روخانی کۆمۆنیزمی ئەوروپا چووە نێوچەرخی دوای جەنگی سارد»(92). هەموو ئەوهەوڵو تێکۆشانەی وڵاتانی بلۆکی سۆشیالیستی لەپێناو گۆڕینی سیستمی جیهانی دایان بەرەو سیستمێکی نوێو بازاڕی ئازادو کرانەوەو تەشەنەسەندنی سەرمایەداری دەڕۆیشتو شکستی هێنا، سەرەڕای کاریگەری دەرهاویشتەکانی جەنگی سارد تەنها وەك قۆناغێکی مێژوی سیاسیو ململانێ نێودەوڵەتییەکان مایەوە. «بە هەقیقەت جەنگی سارد بەدەرنەبوو لە ململانێو گرژیو بەیەکداچوون، جەنگی نێوان دووکەرتی دژبەیەك بەردەوام لەئارادابوو،

بەڵام بۆماوەی زیاتر لە نیوسەدە هیچ تەقەیەك راستەوخۆ بەتوڕەیی نەكرا لەنێوان هەردووكەرتی رۆژهەڵاتو رۆژئاوای كیشوەری ئەوروپا، هەردووكەرت جەنگیان بەرپاكرد لە دەرەوەی ئەوروپا، بەڵام دوژمنە سەرەكیەكان هەرگیز راستەوخۆ بەشەڕ نەهاتن، ئەوەی حوكمی لەسەردراوە خراپترین رەوشی ئاوەدانكردنەوەی دوای جەنگ ماوەی دوای جەنگی جیهانی یەكەم بوو، ئەوروپاو هەموو جیهانی تەنها بۆماوەی بیست ساڵ بەدوورگرت لەترسو رارایيو جەنگ». كارێك كە جەنگی سارد لە جەنگەكانی تری مێژووی مرۆڤایەتی جیادەكاتەوە، بریتییە لەوەی جەنگی سارد كەمترین بەكارهێنانی هێزی سەربازی تێدا بەدیدەكرێت، بەڵكو جەنگێك بوو زیاتر ئابوریو راگەیاندنو ئایدۆلۆژیا رۆڵیان پێدرابوو، هەرچەند قوربانیەكانی جەنگی سارد كەمترنەبوو لەقوربانی جەنگەكانی تر، «لەخانەی گروپی جەنگە مەزنەكانی سەردەمی مۆدێرندا، جەنگی سارد شایەنی پڕكردنەوەی كەلێنێكە، هەڵگری هەمان تایبەتمەندی جەنگەكانی ناپلیۆنو جەنگی جیهانی یەكەمو دووەمە، بەڵام لەگەلێ رووی گرنگەوە جەنگی سارد وەك جەنگەكانی ترنەبوو، بەهەمان شێوە جەنگی سارد كاتو شوێنی موماره‌سەكردنی لەژێردەسەڵاتی مرۆڤدا بووەو وردە وردە بڵاوبۆوە، دەرەنجام زۆر بەهێزتربوو لەجەنگو كوشتار، ئەوموماره‌سەیەش گۆرانی كەلتوربوو كە جیهانی سەدەی بیستو یەك دروستیكرد»(93).

**باسی چو ارەم- ئاكام و كاریگەرییەكانی جەنگ:**

بێگومان هەردیاردە و دەركەوتەیەك ئاكامو كاریگەری ئەرێنی یاخود نەرێنی دەبێت، بەڵام ئایا چەند توانراوە مامەڵە لەگەڵ ئەو كاریگەریانەدا بكرێتو هەوڵی خوێندنەوەو شیكاركردنی بدرێت بۆ واقیعی كۆمەڵگە، بەتایبەتی دیاردەیەكی وەك (جەنگ) كە سەرانسەری دنیا قوربانی دەستی كاریگەریەكانی جەنگن، چونكە

روداو بەڕێوەچونی ئەو هەموو جەنگە یەك لەدوایەکانە بەبێ کۆمەڵێك ئاکامی کۆمەڵایەتی و ئابوریو فەرهەنگیو کاریگەری جۆراوجۆر تێناپەڕێت، کاریگەریەکانی جەنگ هەمەجۆرە، تەواوی بوارەکانی ژینگەو تەندروستیو پـەروەردەو کەلتور دەگرێتەوە، چونکە بەر لەهەر ئامانجێکی تر جەنگ بەجۆرەکانیەوە دەخوازێت بەرامبەرەکەی بە تەواوی لەناوبەرێتو کۆتایی پێبهێنێت.

لە جەنگدا فراوانترین پانتایی بۆ قوربانی کۆمەڵگەیە، چونکە زەمینەی جەنگ لەنێو کۆمەڵگەدا بەڕێوەدەچێت و هەربەئەندامانی کۆمەڵگە خۆشی ئاگری جەنگەکە خۆشدەکرێت، «لە جەنگی جیهانی یەکەمدا دەیان ملیۆن کەس تێداچون و مردن، زیاد لە بیست ملیۆن کەس بریندارو کەمئەندام بوون، ژمارەی بێوەژنەکان گەیشتە پێنج ملیۆنو ژمارەی هەتیوەکان بوو بە (نۆ) ملیۆنو ئاوارە و پەناهەندە و هەڵاتووەکانیش گەیشتە دەملیۆن، لەجەنگی جیهانی دووەمدا ژمارەی قوربانیەکان زۆر لەوە زیاتربوونو ژماردنو پێوانەکردنیان کارێکی ئەستەمە»(94).

بەسەرنجدان لە ژمارەی قوربانیو دەرئەنجامە کۆمەڵایەتیەکان دەردەکەوێت چ کارەساتێکی کۆمەڵایەتی گەورەو گشتگیر بەهۆی جەنگەوە بەرۆکی کۆمەڵگە جیاوازەکان دەگرێت.

جێی ئاماژە بۆکردنە کە دامەزراوە تایبەتمەندو جیهانیەکانی ژنان، پاشان لاوان دەبنە قوربانی یەکەمی ئاکامی جەنگ، «بە پێی راپۆرتێکی واشنتۆن پۆست لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم ملیۆنێك و سێهەزار ژنی ئەمەریکی دەرئەنجامی جەنگ راپێچی زیندان و سـزادراون، تەنانەت ماوەی چەندین مانگ لە سەربازەکان جیاکراونەتەوە لەترسی نەخۆشی ترسناك، پاشان هەندێکیان دەستگیرکراونو سوکایەتییان پێکراوە، بەزۆر راپێچی هۆڵی ئاهەنگەکان دەکران تالەگەڵ پیاوەکان کات بەسەربەرن، رەگەزی مێیەکان ئەوانەی تەمەنیان (43) ساڵ بوایە

بەرەوڕوی کاری قورس دەبونەوە، تیماری سەربازە بریندارەکانیان دەکردو هەندێك كات بە زۆر لاقەیاندەکردن، گوزەرانی ئەم ژنانە رۆژانە بەرەوخراپتر دەڕۆیشت، هیچ یەکسانییەك پەیڕەو نەدەکراو بە ئاشکرا مافیان پێشێلدەکرا»(95).

ئەمەش بووەمایەی خولقاندنی چەندین کارەساتی کۆمەڵایەتی گـەورەو بەشداربونی ئەم هۆکارە لە هەڵوەشاندنەوەی خێزانو لەناوبردنی پێوەرو بنەماکانی کۆمەڵگە، دواجار داڕمانی کەسایەتی مرۆڤ.

جەنگی سی ساڵەی نێوان پرۆتستانتو کاسۆلیکەکان لە ناوەڕاستی ئەوروپا رێژەی قوربانیەکانی گەیشتە (6ملیۆن کەس) بەڕێژەی40%ی دانیشتوانی ناوەڕاستی ئەوروپا(96)، ئەو ئامارە رێژەی نامرۆڤایەتیو دەمارگیری رابەرانی ئەودوومەزهەبەی ئاینی مەسیحی دەردەخات کە لە پێناو بەرژەوەندیو لێکنەگەیشتنی ئاینیو مەزهەبیدا ئەوڕێژە بەرچاوەی مرۆڤایەتیان بە کوشتداوە، لە تەواوی شەڕەکاندا لەنێوچوونو فیدابوونی لاوان زیانێکی راستەوخۆیە(97)، بێگومان لەکاتی جەنگدا هەموو شتەکان دەبنە سوتەمەنی جەنگ، جگەلەوەی سەرجەمی پرۆژە ئابوریو پیشەسازیو بازرگانییەکان پەکیان دەکەوێتو لەکاردەخرێن، هاوکات داهاتی وڵاتو نەتەوە دەدرێت بە تەقەمەنیو ئاگری جەنگەکانی پێخۆشدەکرێت.

بەدرککردن بەو راستییەی جەنگو پێداویستییە جەنگییەکان بازاڕێکی باشیان دەبێت، بۆیە بڕیار بەدەستو کاربەدەستەکان دەبنە هۆکاری گواستنەوەو گەیاندنی ئەو پێداویستییانە وەك بازرگانێك ، «لە هەندێك وڵاتانی رۆژئاواییدا بەڵێندەرەکانی-بەرگری نیزامی- کۆمپانیا گەورەکانن، لەنێو (500) کۆمپانیای گەورەی ئەمەریکیدا نزیکەی (3/4) ئەوکۆمپانیایانە گەورەترین رێککەوتننامە نیزامییەکان لەگەڵ حکومەتی ئەمەریکا دەبەستن، پەیوەندی زیندوو لە نێوان زۆربەی

ڕێبەرانی نیزامیو بەڕێوەبەرانی ئاستی سەرەوەی ئەو کۆمپانیایانەدا هەیە، لە ماوەی شەڕی ڤێتنامدا (40%)ی گەورەترین کڕینو فرۆشتنەکانی (25) بەڵێندەری نیزامی پێوەندی هەبوو بەبەرهەمهێنانی بەرگری، بەڵام (15) ساڵ دوای شەڕ ئەو رادەیە گەیشتە (10%)، بە واتایەکی دیکە بەشداری لەبەرهەمهێنانی نیزامی لەگەڵ پێویستیو گوشاری سیاسیدا هاوئاهەنگ دەکرێت، نەك بە پێچەوانە»(98). ئەمە جگەلەوەی بەوهۆیەوە تووشی دارِمانی ئابوریو پیشەسازی دەبێتو بەدوایدا فەسادی ئابوریو ئەخلاقی بەدوای خۆیدا دێنێت. یاخود بەهۆی جەنگەوە وڵات توشی قەرز دەبێت، ئەمە جارێکی تر دەبێتە فشار بۆ سەر هاوڵاتیانو ئەندامانی کۆمەڵگە، کە حکومەت و بڕیار بەدەستەکانی دەوڵەت بێتواناو بێ بڕیار دەبن لە ئاست چارەسەرکردنی قەیرانەکاندا، بۆنموونە «لە ئەنجامی جەنگەکەی لەگەڵا ئێران، عێراق لەلای وڵاتە دەوڵەمەندەکانی کەنداو کەوتبووە ژێرباری قەرزێکی گەورەوە کە دەگەیشتە (30-35) ملیاردۆلاری ئەمەریکی»(99).

بەم پێیە کەمجار هەیە جەنگ ئاکامی ئەرێنی لێبکەوێتەوە، تەنانەت بۆ دەوڵەتو لایەنە سەرکەوتوو براوەکانیش، ئەمەش پەیوەندی بە خاسیەتو کەلتوری جەنگەوە هەیە کە کەس لە جەنگدا براوە نییە، بەڵکو هەردوولا دۆڕاوون، براوە ئەوەیە ناچێتە مەیدانی جەنگەوەو ململانێکانی بە ئاشتیو دیپلۆماسییانە چارەکات، یان لەهەر بارێکدابێت سوودی لێوەردەگرێتو پێکهاتەو رەهەندە نەتەوەییەکانی خۆی پێ بەهێز دەکات لەسەرجەم بوارەکانی ئابوری، سیاسی، کەلتوری، پیشەسازی، تەکنەلۆژیا، زانستیو هتد. نمونەشمان یابانە کە پاش کارەساتی هێرۆشیما و ناکازاکی ئەو شکستەی لە جەنگدا تووشی بوو لەسەر دەستی ئەمەریکییەکان، دواجار بڕیاریدا بە زانست، پیشەسازی و تەکنەلۆژیا تۆڵەبکاتەوە و سەربکەوێت، سەرئەنجام بەڵێن و گریمانەکەی خۆی بردەسەر.

## بەشی دووهەم-جەنگی عێراق - کوەیت:

باسی یەکەم -سەرەتای ناکۆکی عێراق و کوەیت.
باسی دووەم- هۆکارەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق – کوەیت.
باسی سێهەم- بەرپابونو هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق-کوەیت.

**باسی یەکەم - سەرەتای ناکۆکی عێراق و کوەیت:**

عێراق و کوەیت دوو وڵاتـی کیشوەری ئاسیان و خاوەنی مێژوویەکن لە پەیوەندی و ململانێ.

«کوەیت دەکەوێتە بەشی سەرەوەی باکوری کەنداوی عەرەبی و لە نێو بازنە هەستیارەکەدایە، وڵاتێکی بچوکە لە رووی قەبارەی جوگرافی و ژمارەی دانیشتوانەوە. وەك هەروڵاتێکی تری سەر زەوی خاوەنی پەیوەندی ئابوریو سیاسیو بازرگانیو دبلۆماسسییە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێیدا، وڵاتێکە لە کاتی بوونی هەرجۆرە کێشەیەکدا پەنا بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی نابات»(100).

هەرچەندە کوەیت وڵاتێکی بچوکە لە رووی ژمارە و قەبارەوە، بەڵام توانیویەتی بەهۆی سامانی سروستی و نەوتی خاوەوە توانایەکی ئابوری باش بۆخۆی بە دەستبهێنێت و تارادەیەکی باش لە بازنەی دراو و ئابوریو بازرگانی جیهانیدا خۆی بسەلمێنیت. «لە ساڵی (1916)دا رێکەوتنی بەریتانیاو کوەیت راگەیەنراو کوەیت لە ساڵی (1962)دا، بوو بە وڵاتێکی سەربەخۆ»(101).

«لە کۆندا عێراق بە وڵاتی نێوان رووبارەکان نـاسراوە، بەڵام خاکەکەی تێپەڕی کردبوو لـەو ناوچەیەی کە دەکـەوتـە نێوان رووبارەکانی دیجلە و فورات، سەرجۆنی ئەکەدی بە دامەزرێنەری یەکەم دەسەڵات دادەنرێـت کە لە چوارچێوە جوگرافیەکەیدا هەردوو رووبارەکە لەخۆبگرێت»(102). هەروەها بە پێی هەندێك لەسەرچاوە رەسمییەکان «پێوانەی جوگرافی عێراق دەگاتە (438هەزار) کیلۆمەتر چوارگۆشە و ژمـارەی دانیشتوانی نزیکەی (22ملیۆن) کەسە، بە زیادکردنی نزیکەی (3ملیۆن ) کەس کە لە تاراوگەو دەرەوەی عێراق دەژین بەهۆی سیاسەتە دیکتاتۆریەتەکەی رژێمی سەدام حسێنەوە»(103).

کوەیت وڵاتێکە کەمتر هەوڵی بۆپتەوکردنو بیری لە دروستکردنی

هێزی سەربازیو بەرپاکردنی جەنگ کردۆتەوە، بۆیە هەردەم کوەیت لەهەڵوێستو پێگەی بەرگری لەخۆکردندابووە نەك هێرش بردنو پەلاماردان، «هەڵوێستی کوەیت هەمیشە بەرگریکارانە بووە لەگەڵ دراوسێکانیدا»(104).

هەڵوێستی میانڕەوانە و دۆستانەی کوەیت وایکردووە لە زۆرینەی کێشەو قەیرانەکاندا بە تەنگ وڵاتانی ناوچەکەوە بێت و یارمەتیان پێشکەش بکات، تائەو وڵاتانە لە کاتی هێرشو پەلاماردانددا بە تەنگ کوەیتەوە بچن.

«لە کۆتایی سییەکانی سەدەی رابـردودا پەیوەندییە سیاسیەکانی عێراقو کوەیت گرژیو ئاڵۆزی بەخۆیەوە دی، بەهۆی دەستێوەردانی عێراق لەکاروباری ناوخۆی کوەیتو رێزنەگرتن لەڕێکەوتنو پەیماننامەکانی نێوان هــەردوولا لەماوەی رابـــردوودا»، لەچلەکانو پەنجاکانیشدا پەیوەندیەکان هەمیشە رووی لە خراپی کردووە و کەمتر دۆستایەتی پێوە دیاربووە، زۆرینەی هۆکارەکەش دەگەڕایەوە بۆحکومەتی عێراقی، چونکە هەمیشە کوەیتی بە بەشێك لە خاکی عێراقی دەزانی. «بەڵام هیچ شتێکی تازە روووینەدا لە نێوان عێراق و کوەیتدا لەسەر سنور لە ماوەیساڵانی چلەکانی سەدەی رابردوودا کە مایەی دڵخۆشی و ئومێدبێت»(105).

جەنگی عێراق کوەیت، جۆرێکی نوێی لە پەیوەندی نێوان عێراق و کوەیتدا هێنایەکایەوە، کوەیت زیاد لە هەر وڵاتێکی تری عەرەبی یارمەتی عێراقیدا لەو جەنگەداو هاوکاری زۆری پێشکەش بە حکومەتی عێراقی کرد، ئەگەرچی ئەو هاوکاریە لەسەر بڕیاری ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوبوو. «هەڵوێستی کوەیت لە جەنگی عێراق ئێراندا لەسەر رای زۆرینەی وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بونیادنرابوو، بەپشتبەستن بەوەی شکستی عێراق لەوجەنگەداو سەرکەوتنی ئێران بەمانای هەڕەشەی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە، لەبەرئەوە لە رووی داراییو راگەیاندنەوە پشتگیری عێراقی کرد»(106).

پەیوەندی عێراق و کوەیت لە دروستبوونی عێراقەوە لە ساڵی (1921) تاکاتی پەلاماردانی کوەیت لە لایەن عێراقەوە، بە ماوەی گومان و دڵەڕاوکێی بەردەوام ناودەبرێت، جگەلەوەی وڵاتانی خۆرئاوا رۆڵێکی گرنگیان لە پەیوەندی نێوانیاندا هەبوو، هەروەها سەرجەمی ئەو سیستم و دەسەڵاتدارانەی حوکمڕانێتی عێراقییان گرتۆتە دەست، هەمیشە بانگەوازی ئەوەیانکردووە کوەیت بەشێکە لە عێراقو دەبێت بچێتەوە سەر سنورو جوگرافیای عێراق. «دوای ئەوەی کوەیت لە ساڵی (1961) لەژێر دەسەڵاتی بەریتانی دەرچوو، عێراق راستەوخۆ داوای کوەیتی کرد، بە بەڵگەی ئەوەی کوەیت بەشێکبووە لە ویلایەتی بەسرەی عوسمانیو عێراق. عەبدولکەریم قاسم رایگەیاند کوەیت بەشێکی نەبچڕاوە لە عێراق و هەڕەشەی رزگارکردنی کوەیتی کرد، بۆ پاراستنی کوەیت پێشەکی سوپای بەریتانی و سعودیە هاتنە کوەیت، دوای ئەوە کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی مەسەلەی بەرگریکردنی کوەیتی گرتەخۆ. بەپێچەوانەی دژایەتیو هەڕەشەی عێراق، کوەیت لە کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی بە ئەندام وەرگیرا، لە (1972/10/4) دان بەسەربەخۆیی کوەیتدا نرا. لە ساڵی (1973) ناکۆکی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عێراق-کوەیتدا رویدایەوە»(107).

**باسی دووهەم- هۆکارەکانی هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق – کوەیت:**

لە سەرەتای مانگی ئابی (1990)دا، رژێمی عێراق خۆی دووچاری هەڵەیەکی گەورەو کوشندە کرد، ئەویش داگیرکردنی کوەیت بوو، کە دەکەوێتە سەر کەنداوی عەرەبو خوارووی وڵاتی عێراقەوە و لەسەر سنوری شاری بەسرە، ئەم کارە چەندین خوێندنەوەی جیاجیای لەلایەن ناوەند و دامـەزراوە و هێزو کەسایەتییە سیاسییەکانەوە بۆکراوە و هەریەکەیان بەجۆرێك داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقی دراوسێ

و (پارێزەری دەروازەی ڕۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەب) شیکار دەکەن و لێکی دەدەنــەوە. ڕژێمی بەعس چەند پاساوێکی لاوازو بێبناغەی دەهێنایەوە، کە بە هۆیەوە وڵاتی کوەیتی داگیرکرد، بەڵام سەرجەمی بەهانەکانی عێراق کەمترین واقعیەتییان تێدا بەدی نەدەکراو سەرئەنجام بە زەبـری هێزی سەربازی لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانیەوە دەرپەڕێنراو شکستی گەورەی خوارد. بەم پێیە داگیرکردنی کوەیت بۆچەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، لەوانە:.

**•هۆکاری جوگرافی و پێگەی وڵاتی کوەیت:**

لە رووی جوگرافی و هەڵکەوتەی جیۆپۆلەتیکییەوە کوەیت خاوەنی گرنگی و تایبەتمەندییەکی گەورەیە «کوەیت دەکەوێتە بەشی سەرەوەی باکوری کەنداو و لە نێو بازنە هەستیارەکەدایە»(108).

ئەو بازنە هەستیارە بۆتە دەروازە بۆسەر کەنداو و پێکەوەبەستنی سنوری نیشتیمانی عەرەبی و کۆماری ئیسلامی ئێران. عێراق دەیویست بە داگیرکردنی کوەیت، ئەو پێگە جوگرافییە بۆخۆی مسۆگەر بکات، جگە لەوەی دەروازەیەکی بۆسەر دەریا دەکەوێتەبەردەست، هاوکات خاڵێکی بازرگانی ستراتیژی گرنگ داگیردەکات.

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین دەروازەیەکی دەریایی بۆ هاتووچۆی کەشتییە نەوت هەڵگرەکانی عێراق، زیاتر هانی حکومەتی عێراقیدا تاکوەیت داگیربکات، «پێویستی عێراق بۆڕییەك بوو بۆ بارکردنی کەشتییەکانی نەوت دوور لە هەڕەشەی سەربازی ئێران، عێراق لە چێوەی سنوورو ئاوی خۆی ئەوەی نەبوو. پانی ئاوی سنوری کەناری عێراق (38میلە)، تەنها ئەو بەندەرانەی کە ئێران بە سەریاندا زاڵنەبێت دوورگــەی (واربــاحو بۆبیان)ن. کوەیت لە ترسی ئــەوەی عێراق بۆ هەمیشە دەستبەسەر ئەو دوورگــانــەدا بگرێت، خواستی عێراقی بەجێنەگەیاند، عێراق لە (20ی مارتی1973) باکوری کوەیت‌و دوورگەی

بۆبیانو سامیتەی داگیرکرد، بەو هۆیەوە سنووری عێراق کوەیت داخرا، پاش ساڵی (1975) پەیوەندی عێراق و کوەیت چاکبوو، عێراق وازی لە خواستەکانی خۆی هێنا(109).

پێگەی جوگرافیو جیۆپۆلەتیکی کوەیت، کاریگەری سەرەکی هەبوو لە جوڵاندنی عێراق بۆ داگیرکردنی کوەیت و دەستگرتن بەسەر تەواوی خاڵە بازرگانیو دەروازە ئاویەکانیدا تا هاتوچۆی بێکێشەی کەشتیەکانی مسۆگەر بکات.

عێراق خاوەنی سامانێکی سروشتی بوو، بەڵام خاوەنی سیاسەتێکی وابوو بۆخۆی دەیزانی تاسەر ناتوانێت رێگەی هاتوچۆی بەدنیای دەرەوەی خۆی مسۆگەربکات، چونکە دڵنیابوو لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا تووشی کێشە دەبێت، هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا کە رێگە و دەروازەیەکی ئاوی و دەریایی دابین بکات، «عێراق وڵاتێکی دەوڵەمەندە بە سامانی سروشتی لە کانزاو زەوی و رووبار و توانا مرۆییەکانی، بەڵام هیچ دەریچەیەکی نییە بۆ سەردەریا، هەروەها ناتوانێت هیچ جۆرە پەیوەندییەکی زەمینی دەریایی لەگەڵ دنیای دەرەوە بە راستەوخۆ ئەنجامبدات»(110).

بڕیاری داگیرکردنی کوەیت لای حکومەتی عێراق خاڵێکی چەسپاوبوو لە نەخشەی کارو ئامانجی داهاتودا، کە دەبێت بیکاتە واقیع و دەروازەیەك بە سنوری جوگرافی خۆیەوە، بۆئەوەی بتوانێت دەرچەو دەروازە ئاوییەکانی کوەیت دابینبکات، بۆ ئەومەبەستە لە هەوڵی پەیداکردنی مێژوویی بوو وەك پاساوێك بۆئەم کارە، «سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەدەکەن هیچ جۆرە سنورێکی جوگرافی مێژوویی لە کۆن و نوێدا نییە لەنێوان کوەیتو عیراقدا، هیچ نەخشەیەکی جیهانیو خۆرئاوایی ئاماژە بۆ وڵاتێکی کەنداو ناکەن، تەنها لەم ماوەی دواییەدا نەبێت. تێکەڵاوییەکی خێڵەکی زۆر لەنێوان دانیشتوانی کوەیتو باشوری عێراقدا هەیە، کاتێك یەکەمجار کوەیت وەك وڵاتێکی بازرگانی دەرکەوت ، بەشێك بوو لە فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو

بەشێك بووە لە ناوچە ملمەچەکان بۆ دەسەڵاتی عوسمانییەکان. کوەیت لە بواری کارگێڕییەوە بەشێکبووە لە ویلایەتی بەسرە»(111).

ئەم لایەنانە هۆکاربوون بۆ داگیرکردنی کوەیت لە لایەن حکومەتی عێراقەوە و هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی بۆ یەکجاری دەستبەسەر کەنداودا بگرێت و بیکاتە دەروازەیەکی گرنگی بازرگانیو کەناڵێکی پەیوەندی دەرەکی لەڕێی دەریاوە.

**•هۆکاری ئابوری :**

لە کاتی داگیرکردنی کوەیتدا، عێراق وڵاتێکی قەرزداربوو بەهۆی زۆریو بێپلانی رژێمی عێراق لە پرۆژە و پیشەسازی سەربازی و تێچونی زۆری شەڕی هەشت ساڵەی عێراق ئێران، عێراق پێیوابوو بە داگیرکردنی کوەیت دەبێتە خاوەنی زۆرترین پارە لە دنیادا، جگەلە دەستبەسەر داگرتنی وڵاتێك، ئەوا دەتوانێت قەرزەکانی بداتەوە و پارەیەکی زۆری تری دەستبکەوێت، بە تایبەتی وڵاتێکی وەکو کوەیت کە رێژەی قەرزەکانی لای حکومەتی عێراق لە چەند ملیار دۆلارێك تێپەڕی کردبوو، «رێژەو قەبارەی یارمەتییەکانی حکومەتی کوەیت بۆ عێراق لەکاتی جەنگی عێراق کوەیتدا گەیشتبووە نزیکەی (14ملیاردۆلاری ئەمەریکی) هەڵبەت عێراق خواستی بوو کە بتوانێت، بە زووترین کات لەڕێگەی بەرزکردنەوەی نرخی نەوتەوە ئەو قەرزانەی کوەیت بداتەوە، ئەویش بە کەمکردنەوەی رێژەی بەرهەمهێنانی نەوت لەڕێکخراوی ئۆپیکدا، بەڵام کوەیت بەپێچەوانەوە رێژەی بەرهەمهێنانی نەوتی زیاترکرد.

هەندێك لە چاودێرانی سیاسی ئەوهەڵوێستەی کوەیتیەکانی بەوە لێکدایەوە کە وەك کارتێکی فشار لە دژی حکومەتی عێراقی بەکارهێناوە بۆچارەسەرکردنی ئەوکێشە سنورییە هەڵپەسێردراوانەی لە نێوان هەردوو وڵاتدا لە مێژوویەکی دێرینەوە هەبووە و تائەوکاتە بە ناجێگیری ماوەتەوە»(112).

لێرەوە کەمکردنەوەی بەرهەمهێنانی نەوت لەلایەن حکومەتی عێراقەوە نەیتوانی کاریگەرییەك دروستبكات، بەمەش زیانێکی تری دارایی گەورە بەرۆکی حکومەتی عێراقی گرت، بۆیە پێیوابوو بە جەنگ و داگیرکردنی کوەیت دەتوانێت تۆڵەبکاتەوە و دەستبەسەر تەواوی چاڵە نەوتییەکانی کوەیتدا بگرێت و کۆنترۆڵی بەشێکی زۆری نرخی نەوتی جیهانی بکات.

عێراق هەمیشە حکومەتی کوەیتی بەوە تۆمەتبار دەکـرد کە سنورەکانی عێراق دەبەزێنێت، تا لە چاڵە نەوتی رومێلە نەوتی خاو بۆخۆی ببات‌و بەنایاسایی داگیری بکات، بە تایبەتی لەوکاتەوە کە گرژی لە نێوان هەردوولایاندا دروستبوو لەسەر رێژەی قەرزە کەڵەکەبووەکان‌و رێژەی سودەکەی، ئەمە جگەلەو پێداویستیانەی عێراق لە کوەیتی داوا دەکرد بۆ بونیادنانەوەی بینای ئابوری داڕوخاوی(113).

بە پێی سەرچاوە و ئامارە تایبەتەکان رێژەی نەوتی خاو لە کوەیت بڕێکی زۆرو بەرچاوە «کوەیت وڵاتێکی زۆر دەوڵەمەندە و سێهەم گەورەترین پاشەکەوتی نەوتی جیهان لەم ناوچەیەدا کۆبۆتەوە، بە داگیرکردنی کوەیت رژێمی عێراق دەبووە خاوەنی (25%)ی نەوتی جیهان. هەرلایەنێکیش ببێتە خاوەنی ئەم سامانە، بە واتا دەبێتە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی و کاریگەری لەسەر نرخی نەوت‌و زۆر بواری تر دەبێت لەناوچەکەو لەجیهاندا. لە ئەنجامی جەنگی (ئێران-عێراق)دا، عێراق کەوتبووە ژێرباری قەرزێکی گەورەی وڵاتانی کەنداو دەگەیشتە (30–35)ملیارد دۆلاری ئەمەریکی. عێراق بە تەنها (10ملیاردۆلار) قەرزداری کوەیت بوو، بە داگیرکردنی کوەیت حکومەتی عێراق ئەم کێشەیەی چارەسەر دەکرد، هەروەها ئەوکاتە ئاشکرانەبوو کە وڵاتانی تری کەنداو بەچ شێوەیەك قەرزەکانی خۆیان لە عێراق وەردەگرنەوە. لە هەمانکاتدا بە داگیرکردنی کوەیت نرخی نەوت بەلایەنی کەمەوە بۆ مەودایەکی نزیك بەرزدەبۆوە و کاریگەری عێراق لەسەر دانانی نرخی

نەوت لەچوارچێوەی ڕێکخراوی ئۆپیکدا گەشەی دەکرد. واتا ئەگەر داگیرکردنی کوەیت بۆ هەمیشە بەردەوام بوایە، ئەوا قەیرانی قەرزی عێراق بەیەکجار چارەسەر دەبوو»(114).

(سەدام حسێن) هەمیشە ئەوەی ڕادەگەیاند کە جەنگی ئێران-عێراق، جەنگی عەرەبو فارس بووە و عێراق لە جیاتی هەموو نیشتیمانی عەرەب ئەو جەنگەی کردووە، بۆیە پێویستە سەرجەم وڵاتانی عەرەبی هاوکاری عێراق بکەن لە قەرزەکانیدا، بە تایبەتی لە لایەن وڵاتانی کەنداو، بە پلەی یەکەمیش وڵاتی کوەیت کە وڵاتێکی دەوڵەمەندبوو، هیچ هاوکارییەکی نەکرد لە ڕووی داراییەوە و لە قەرزەکانی خۆی خۆش نەبوو، لە لایەکی ترەوە بڕی بەرهەمی نەوتی زیاتر کرد و بەو زیادکردنە عێراق زیانێکی کاریگەری بەرکەوت(115).

**•هۆکاری ڕامیاری:**

بارودۆخی عێراق لە پاش جەنگی هەشت ساڵەی ئێران، بەهۆی ئەو شکستەی توشی عێراق بوو لە ژێرخانی ئابوری، ڕێژەیەکی زۆر لە خەڵکی بێکار پەیدابوون، کە لای حکومەتی عێراقی وەك ترس و هەڕەشە دەبینرا لەسەر مانەوەی سیستم و ڕژێمەکەیان و هەوڵدان بۆ ڕاپەڕین و کودەتا لە لایەکی تر، چونکە بۆخۆی ئەوەی دەزانی ئەوسیاسەتەی لەگەڵ هاوڵاتیانی عێراقیدا پراکتێزەی دەکات، تاچەند دوژمنکارانە وشۆڤێنیستانەیە. «ئەگەر ئەو بارودۆخە نەخوازراوەی ئابوری عێراق بە هۆی دەرئەنجامی جەنگی ئێرانەوە، بنەمای سەرەکی و بزوێنەری ڕووداوەکان بێت، ئەوا ئەو بنەمایە کاری خۆی بە چالاکی دەکات لەسەر ژینگەی سیاسی- نێودەوڵەتی، عەرەبی، هەرێمی»(116).

بۆیە هەردەم حکومەتی عێراقی لە هەوڵدابوو ئەوخەڵکە بێکارە، پێکەوە لەگەڵ زیاتر لە سەدان هەزار سەرباز سەرقاڵیان بکات بە جەنگێکەوە لە دەرەوەی عێراق، ئیتر بەبێ ئـەوەی گوێ بدرێت

به چارەنووسی ئەوکەسانەی ڕەوانــەی جەنگەکە دەکرێن لەلایەك، لەبەرچاونەگرتنی کۆی ئەو کارەسات و قەیران و نەهامەتیانەی ڕووبەڕوی تەواوی گەڵانی عێراق دەبێتەوە و وڵاتێك لە باکور تا باشوری وێران و کاولدەکات لە لایەکی ترەوە.

ســەدام حسێن پێشبینی دەکـرد بارودۆخی ناوخۆیی‌و عەرەبی‌و نێودەوڵەتی لەبەرژەوەندی داگیرکردنی کوەیت دایە، لەناوخۆی عێراقدا حزبی بەعس بووە تاکە حزبی فەرمانڕەوا لە عێراقدا، بە تایبەتی پاش ئەوەی ئەوحزبە توانی شکست بە بەرەی نیشتیمانی بهێنێت‌و حزبی شیوعی عێراقی لە کارو مەیدانی چالاکی سیاسی بە تەواوی دووربخاتەوە، جگەلەوەی توانیویەتی بزووتنەوەی چەکداری کوردستان پاکتاو بکات و هێزێکی سەربازی پێکبهێنێت بە شێوەیەك نمونەیی بێت لە مێژووی عێراقدا، بارودۆخی عەرەبی توشی بەریەککەوتن‌و هەڵوەشان دەچوو بە هۆی کێشەو گرفتەکانی نەوتەوە، جیهان سەرقاڵی ئەنجام‌و چارەسەرکردنی کێشە هەڵپەسێردراوەکانی سەردەمی باڵادەستی جەنگی ساردبوون»(117).

لەلایەکی تر سەدام‌و حزبەکەی بانگەوازیان دەکرد کە تاکە حزب‌و سەرکردەی هەموو نیشتمانی عەرەب‌و ناوچەکەیە، بە تایبەت دوای ئەوەی لە جەنگی ئیران-عێراقدا وڵاتانی ئەوروپاو ڕۆژئاواو ئەمەریکا هاوکارییان کرد، «لەلایەنی هەرێمییەوە سێ هۆکار هەیە ئاماژە بە - سەرکردەیی بوونی عێراق – کردووە و بواری چالاکی‌و جوڵە کراوەبووە لەبەردەمیدا، یەکەم، چونە دەرەوەی ئێران لە هاوکێشە هەرێمییەکان تائاستێکی زۆرو دەرکەوتنی عێراق وەك بەهێزترین لە ناوچەکە، هۆکاری دووەم، بێهێزی (ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو) کە لەنێوان وڵاتە ئەندامەکانیدا هەمیشە کێشەو ناکۆکی هەبوو، سەدام حسێن ئاماژەی دەکرد بۆئەوەی کە کاردەکات ئەو ئەنجومەنە هەڵبوەشێنێت بە هەر ڕێگەو شێوازێك بێت، هۆکاری سێیەم تایبەتە بە کوەیت، ئەویش

ئەو ناكۆكیو ململانێیە بوو لە نێوان ئۆپۆزسیۆنی كوەیتی و حكومەتی كوەیتدا هەبوو سەبارەت بە ئەنجومەنی نیشتیمانی و ئەنجومەنی گەل لە ساڵی (1990)، ئەمە بوەهۆی دروستبوونی بەریەككەوتنو دەستگیركردنی نەیارانی حكومەت، دروستبوونی ئەو بارودۆخە سیاسییە ئومێدێكی وای لای سەركردە عێراقییەكان دروستكرد تابەرەی ناوخۆیی كوەیت دابەشببێت، پێشبینی ئەوەیاندەكرد ئەو ئۆپۆسزیۆنەی حكومەتی كوەیتی بە گوڵ پێشوازی لە -سوپای عێراق-ی رزگاركەردەكەن»(118).

ئەمە جگەلەوەی كە عێراق دەیویست بیشارێتەوە كە بە شكستەوە لە جەنگی عێراق ئێران هاتە دەرەوە، بۆیە دەیویست پیشانیبدات هێشتا بەهێزەو سەركەوتوەو حساب بۆ دوژمنەكانی ناكات و ئەوەی ویستی دەیكات و هیچ مەترسییەكی نییە و پەلاماردانی كوەیتی وەك هەڕەشەیەك بۆ تەواوی وڵاتانی عەرەبی و ناوچەكە تەماشا دەكرد، «عێراق لە پاش جەنگی هەشت ساڵەی ئێران، خۆی لە بارودۆخێكی ناهەمواردا بینییەوە، بەهێز و بێهێزیش، لە هەمانكاتدا حكومەتی عێراق لە دوای وەستاندنی جەنگەكە هێشتا خاوەنی (55) فیرقەی سوپابوو، واتا خاوەنی ملیۆنێك سەربازی خاوەن ئەزمونی جەنگ بوو، هەروەها (500) فڕۆكەی سەربازیو نزیكەی (5000) دەبابە بوو، بەڵام لە رووی مادی و داراییەوە وڵاتەكە بە تەواوی ئیفلاسی كردبوو. لە سەرەتای جەنگدا لە (1980)، حكومەتی عێراق خاوەنی (36ملیاردۆلار) لە پارەی یەدەگ و دانراوبوو، بەڵام پاش جەنگەكە (1988)، (80ملیاردۆلار) قەرزداری وڵاتانی دەرەوەبوو»(119).

## باسی سێهەم-بەرپابونو هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق- كوەیت

### یەكەم-داگیركردنی كوەیت لەلایەن عێراقەوە:

«لە بەرەبەیانی (2ی ئابی1990)، سوپا پڕچەكەكەی عێراق دەرفەتی ئەوەی بۆڕەخسا لەسەر سنوری كوەیت بڵاوە بكات، حكومەتی عێراقی

بە پێی ڕاگەیاندراوێکی ڕەسمی شکستو ڕووخانی (ئال سەباحی) لە کوەیت ڕایگەیاند، وتەبێژی ڕەسمی حکومەتی عێراقی چونە ناو خاکی کوەیتی بە پێشکەشکردنی یارمەتی ناوبرد، بەوەی لەسەر بانگهێشتی ئەو حکومەتە کاتیو ئازادەی کوەیت هاتوون کە لە ئەنجامی شۆڕشێکی میللی دروستبووە دژ بە ڕژێمی ئال سەباحی گەندەڵ»(120).

حکومەتی عێراقی بە مەبەستی ئەوەی ڕەوایەتی بدات بەو داگیرکردنە، ڕایگەیاند کە لەسەر بانگهێشتی هێزو ئۆپۆسزیۆن کارەدەکات کە خۆیان لە حکومەتێکی ئازاددا دەبیننەوە، واتا نیەتی حکومەتی عێراقی مرۆڤ دۆستانەیە و دژبە زوڵم، ستەم، نادادپەروەرییە و دەیەوێت لە کوەیتدا ئازادی و یەکسانی بێتەئارا.

«کاتێك کوەیتییەکان لە خەودابوون، ڕۆژی دووەمی مانگی (ئابی1990) زیاتر لە سەد هەزار لە ئەندامانی سوپای کۆماری و هێزی تایبەتی حکومەتی عێراقی، سنوری نێودەوڵەتی کوەیتیان بەزاند و بە خێراییەکی زۆر بەرەو پایتەخت چوون. هێشتا هاوڵاتییە کوەیتیەکان لە خەو هەڵنەستابوون کاتێك لە بەرەبانێکی زوودا دەنگی تەقەی فیشەكو فڕۆکە و تانکی عێراق بە ئاگای هێنان لە وەی کە وڵاتەکەیان لەلایەن سوپای عێراقەوە داگیرکراوە و حکومەتە شەرعی و ڕاستەقینەکەیان هەڵاتووە بۆ میرنشینی سعودی عەرەبی»(121).

ئەوەی هاوڵاتیانی کوەیتی توشی شۆککرد، لەو بەرەبەیانە زووەدا وڵاتەکەیان داگیرکراوە و حکومەتەکەیان لە بری پاراستنو بە گریکردن هەڵاتووە بۆ وڵاتێکی دراوسێی.

هەڵبەت ئەوکار و هەڵوێست و پەلاماردانەی کوەیت لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە کارێکی هەڵە و پڕ لە شەرمەزاری بوو بۆ حکومەت و بڕیاربەدەستانی عێراق. «گومان لەوەدانییە داگیرکردنی کوەیت لە (2ئابی1990) لە لایەن عێراقەوە، ترسناکترین و هەڵترین بڕیاربووە لە مێژووی عەرەبی نوێدا»(122).

کارێکی لەوجۆرەی کە سـەدام حسێن بەرامبەر بە وڵاتێکی دراوسێی، لە نیشتیمانی عەرەبی، خاوەنی سنور و دانپێدانانی نێودەوڵەتی کردی، نەك کارێك ئاسایی نەبوو لای هاوڵاتیانی ئاسایی ، بەڵکو تەواوی ناوەندە سیاسیەکانی جیهانی وروژاند.

«لە (2ی ئـابـی1990) تانکەکانی سـەدام چونە ناو کوەیت، خۆرئاواو جیهانی هەژاند، ئەمەریکا و بەریتانیا ئەوەیان بە گوشار خستنەسەر کوەیت دانا»(123). پەلاماردانی کوەیت لەلایەن عێراقەوە هێندەکارێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، کە دوو گەورەترین وڵاتی زلهێزی دنیا باوەڕیان نەدەکرد داگیرکردنەکە بەردەوامبێت، یاخود تەواوی کوەیت بگرێتەوە، بەڵکو وەك سیناریۆ و گوشارێکی توندی عێراق بۆ سەرکوەیت مامەڵەیان لە گەڵ کرد و وەریانگرت، چونکە نامرۆڤانەییو دڕندەیی کارەکە گەیشتە رادەیەکی ئەوتۆ سەردێڕی یەکەمین هەواڵی سەرجەم میدیاکانی جیهان بوو»(124).

حکومەتی عێراق بە هیچ شێوەیەك گوێی بـەوکـاردانـەوە نێودەوڵەتیو هەرێمیو عەرەبیانە نەدا کە لە ئاکامی پەلاماردانەکەی کوەیت دروستبوون، بەڵکو پاش ئەوەی «(لە 2ی ئابی1990) عێراق کوەیتی داگیرکرد، دەسەڵاتێکی سەربەخۆی لە کوەیت دامەزراند، میرییەکە بە ئاڕاستەی بەغداد داوای گەڕانەوەی کوەیتی بۆ عێراق کرد، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەمەیان پەسەند نەکرد و پلانەکەی سەدام حسێن سەرینەگرت»(125).

بە رای هەندێك لە چاودێرانی بواری سیاسەتی نێودەوڵەتی، داگیرکردنی کوەیت سەرەتای جەنگێکی تری کەنداو بوو، «سپێدەی (2ی ئابی1990) بە داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە، ئاماژەیەك بوو بۆ بەرپابوونی جەنگ لە کەنداودا، پاش داگیرکردنەکە عێراق پێکەوەبەستنی هەر دوو وڵاتی لە چوارچێوەی کیانێکی سیاسیدا راگەیاند، بەم پێیە کوەیت بوو بە پارێزگای نۆزدەیەم لە عێراقدا»(126).

## خشتەی ژمارە( ١ )

## پانۆرامای چەند رۆژێکی پەلاماردانی کوەیت لەلایەن عێراقەوە ( یەك )

| رۆژ | روداو |
|---|---|
| ٢ی ئابی ١٩٩٠ | عێراق کوەیت داگیردەکات |
| ٣ی ئاب | ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، میسر داوای کشانەوەی هێزەکانی عێراقیان کرد لە کوەیت. |
| ٤ی ئاب | عێراق هەڕەشەی لە سعودیە کرد، هێزەکان ئامادەکران، ئەمەریکا دژی داگیرکردنەکە وەستایەوە. |
| ٥ی ئاب | یەکێتی ئەوروپا هاوردەی عێراق و کوەیتی راگرت. |
| ٦ی ئاب | نەتەوە یەکگرتووەکان ئابلۆقەی سەر عێراقی راگەیاند. |
| ٧ی ئاب | تورکیا دوو بۆڕییە نەوتییەکەی عێراقی بۆ بەندەری دۆرت پۆل داخست. |
| ٨ی ئاب | - شا فەهدی سعودیە داوای هەڵوێستی ئەمەریکای کرد<br>- عێراق لکاندنی کوەیتی بەخۆیەوە راگەیاند |
| ٩ی ئاب | عێراق سنورەکانی خۆی داخست، بەوهۆیەوە (٣)ملیۆن کۆچبەرو گەشتیاری بیانی کە زۆربەیان میسری و ئاسیایی بوون ڕێیان لێگیرا. |
| ١٠ی ئاب | لە کۆبونەوەی سەرانی عەرەب، لە کۆماری ولاّتانی عەرەبی ئابلۆقەی سەرعێراق و ناردنی لەشکریان بۆکەنداو پەسەندکرد. |
| ١٢ی ئاب | عێراق کێشەی فەلەستینی بە قەیرانەکە بەستەوە، سەدام حسێن داوای لە ئیسرائیل کرد لە فەلەستین بکشێتەوە. |
| ١٥ی ئاب | عێراق جیاوازییەکانی لەگەڵ ئێران نەهێشت و هێڵی زالوەقی ناوەندی شەتولعەرەبی پەسەندکرد. |
| ٢٥ی ئاب | ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان پشتیوانی کردنی ئابلۆقەی سەرعێراق بەهێزی دەریایی پەسەند کرد. |
| ٢٨ی ئاب | سەدام حسێن کوەیتی کرد بە (١٩) یەم پارێزگای عێراق. |
| ٢٥ ی ئەیلول | ئەنجومەنی ئاسایش هاتوچۆی ئاسمانی لە عێراق راگرت. |
| ١٢ی تشرینی یەکەم | ئەنجومەنی ئاسایش نیگەرانی لەبارەی کوشتنی ٢١ فەلەستینی دەربڕی. |
| ٢٩ی تشرینی یەکەم | ئەنجومەنی ئاسایش، عێراقی بە بەرپرسیاری وێرانکردنی کوەیت دانا. |
| ١٨ی تشرینی دوهەم | سەدام حسێن بڕیاری ئازادکردنی بارمتەکانی بە چەند جارێك راگەیاند. |
| ٢٩ی تشرینی دوهەم | ئەنجومەنی ئاسایش بە١٢ دەنگ بەرامبەربە٢ دەنگی ناڕازی و بێدەنگی چین، بڕیاری بەکارهێنانی هێزدەدات، ئەگەر عێراق تا١٥ی کانونی دوهەمی ١٩٩١ لە کوەیت نەکشێتەوە. |

سەرچاوە/ د. ئەوان و. ئەندرسن ود. خەلیل هـ .رەشیدیان : سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٩٥–٢٠٠ .

## تەواوکاری پانۆرامای چەند رۆژێکی پەلاماردانی کوەیت لەلایەن عێراقەوە ( دوو )

| رۆژ | روداو |
|---|---|
| ٣٠ تشرینی دوهەم | جۆرج بوشی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بواری گفتوگۆکردنی لەسەر ئاستی بەرز، دەربارەی قەیرانەکە بەخشی بە عێراق. |
| ٦ی کانونی یەکەم | سەدام حسێن سەرجەم بارمتەکان ئازاد دەکات. |
| ٢٤ی کانونی یەکەم | بەغداد هەڕەشەی هێرشکردنە سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا لە جیهان دەکات، ئەگەر هێز بۆ بەدەرنانی هێزەکانی عێراق بەکاربهێنن. |
| ٢٦ی کانونی یەکەم | ئیسرائیل پەیمان دەدات، گەر عێراق پەلاماری بدات بە توندی وەڵامی دەداتەوە. |
| ٢٩ی کانونی یەکەم | بەریتانیا داوای زۆرترین سەربازی یەدەگی خۆی کرد، کە گەورەترین ئامادەکاری جەنگ بوو پاش قەیرانی سوێس. |
| ٣ی کانونی دوهەم١٩٩١ | - نوێنەرێکی فەرەنسا دەچێتە بەغداد.<br>- بۆش رایگەیاند بۆ دواهەوڵی ئاشتی ئامادەم. |
| ٥ی کانونی دوهەم | عێراق بۆ کۆبونەوە لەگەڵ ئەمەریکا ئامادەیە. |
| ٩ی کانونی دوهەم | جێمس بیکەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکاو تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق لە جنێف کۆبونەوە . |
| ١٢ی کانونی دوهەم | جاڤێرپێرێزدی کویلار رازگری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەغداد لەگەڵ سەدام حسێن کۆبۆوە. |
| ١٥ی کانونی دوهەم | نەتەوەیەکگرتووەکان دواکات بۆکشانەوەی عێراق لە کوەیت دیاری دەکات |
| ١٦ی کانونی دوهەم | دواکاتی دیاریکراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەردەچێت، هەوڵی ئاشتی فەرەنسا پەکی دەخرێت. |
| ١٨/١٧ی کانونی دوهەم | هێرشی ئاسمانی بۆ سەرهێزەکانی عێراق دەستپێدەکات |
| ٢١ی کانونی دوهەم | ٤ ئێستگەی لێکۆڵینەوەی ناوکی عێراق بۆمباران کرا. |
| ٢٢ی کانونی دوهەم | وڵاتانی خۆرئاوا سەدام حسێن بە بەرپرسیاری تاوانەکانی جەنگ دادەنێن |
| ٢٣ی کانونی دوهەم | گەڕەکێکی تەلئەبیبی ئیسرائیلی بە موشەکی سکۆدی عێراق لێدەدرێت |
| ٢٦ی کانونی دوهەم | ئەمەریکا عێراق بە پیسکردنی ئاوی کەنداو بە نەوت تاوانبار دەکات |
| ٢٩ی کانونی دوهەم | باشترین فرۆکە جەنگییەکانی عێراق هەڵدێن بۆئێران |
| ٣١ی کانونی دوهەم | هێزەکانی عێراق، خەفاجی لە سعودیە دەگرن |
| ١ی شوبات | خەفاجی لەلایەن هێزەکانی سعودیە ئازاد دەکرێت |
| ١١ی شوبات | جوڵەی ئاشتی سۆڤیەت دەستپێدەکات |
| ١٤ی شوبات | ئەمەریکا پەناگەیەکی مەدەنی پڕ لە خەڵك بۆمباران دەکات. |
| ١٦ی شوبات | جۆرج بوش داوا لە عێراقییەکان دەکات سەدام حسێن لەسەر کار لابەرن. |

سەرچاوە/ د. ئەوان و. ئەندرسن ود. خەلیل هـ .رەشیدیان : سەرچاوەی پێشوو ، ل١٩٥–٢٠٠ .

**تەواوکاری پانۆرامای چەند رۆژێکی پەلاماردانی کوەیت لەلایەن عێراقەوە** (سێ)

| رۆژ | روداو |
|---|---|
| ١٦ی شوبات | عێراق رازی دەبێت لە کوەیت بکشێتەوە بە(٨ مەرج). |
| ١٨ی شوبات | بەریتانیا شوێنێکی ناسەربازی لە فەلوجە بۆمباران دەکات. |
| ٢٠ی شوبات | جۆرج بۆش نەخشەی ئاشتی سۆڤێت پەسەند ناکات. |
| ٢٣ی شوبات | جۆرج بۆش کات بۆکشانەوەی عێراق لە کوەیت دیاری دەکات. |
| ٢٣/٢٤ی شوبات | هێرشی زەوی دەست پێدەکات. |
| ٢ی مارت | جەنگ رادەگیرێت . |

سەرچاوە/ د. ئەوان و. ئەندرسن ود. خەلیل هـ .رەشیدیان : سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٩٥-٢٠٠ .

**دووەم- کاردانەوە هەرێمی و جیهانییەکانی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە:**

داگیرکردنی وڵاتێکی دانپیدانراوی نێودەوڵەتی، دەبێتە هۆی دروستبوونی چەندین کاردانەوەی هەرێمی و نێودەوڵەتی، چونکە ئەوپەلاماردانە دەبێتە مایەی دروستکردنی هەڕەشە و مەترسی بۆسەر ئاشتی و ئاسایشی جیهانی و چارەنوسی وڵاتانی تریش دەخاتە بەردەم گومان و پرسیاری وردەوە، لەوکاردانەوانەش:

**1.کاردانەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان:**

رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، بەوپێیەی دروستبووی پاش جەنگی جیهانی دووەمەو ئامانجی سەرەکی دابینکردنی ئاشتیو ئاسایشی جیهانیو نەهێشتنی شەڕ و ئاژاوەو راگرتنی هاوسەنگی

هێزەکانە، ئیتر بە هۆکاری ئاشتییانە بێت یاخود بە هۆکاری هێزو توندوتیژی، وەك لە «بەشی شەشەم و فەسڵی حەوتەم، لە میساقی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە»(127).

لەبەر ئەوهۆکارەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆکرد، ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بە چەند قۆناغێك کاردانەوەی نواند لە بەرامبەر داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە، کۆی ئەوبریار و هەڵوێستانەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بە ئامانجی چارەسەرکردنی خێراو کۆتایی ئەو قەیرانەبوو کە دەسەڵاتدارانی عێراق لە ناوچەکەو جیهاندا خوڵقاندبوویان.

بوونی چەند قۆناغێك لە هەڵوێستی ڕێکخراوەکە، یاخود جیاوازی و جۆراوجۆری بڕیارەکان پەیوەندی بە ئاستی قەیرانەکەوە هەیە کە بڕیارەکەی تیادا دەرکراوە .

قۆناغی یەکەم: «لە دەستپێکردنی داگیرکردنەکە تادەرکردنی بڕیاری ژمارە (678) لە (29ی نۆڤەمبەری1990) بەردەوام دەبێت، ئەو قۆناغە ئەنجومەنی ئاسایش ڕۆڵی کاراو سەرەکی تیادا نواند، بە جۆرێك توانی ئـەورۆڵـە وینابکات کە لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆی دیاری کراوە ، بۆ سەپاندنی ڕێزگرتن لە یاسای نێودەوڵەتی و سزادانی ئەوانەی لێیدەردەچن»(128).

لەم قۆناغەدا ئەنجومەنی ئاسایش توانی ژمارەیەك بڕیار سەبارەت بە ئیدانەکردنی داگیر کردنەکە و سەپاندنی سزاو بەکارهێنانی هێزی سەربازی بۆکشانەوەی عێراق لە کوەیت دەربکات.

قۆناغی دووەم: «ئەوقۆناغە لە دەرچونی بڕیاری تەفویزکردنی وڵاتانی هاوپەیمانان بۆ ئـازاد کردنی کوەیت بە بەکارهێنانی

هێزی سەربازی دەستپێدەکات، تابڕیاری راگرتنی جەنگ لەلایەن هاوپەیمانانەوە لە (27ی شوباتی 1991)، لەوماوەیەدا بە پراکتیکی رۆڵـی سەرکردایەتی قەیرانەکان گـواسـترابـووەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا»(129)، بەکارهێنانی هێز لەم قۆناغە دا مەرج بوو، چونکە کاری ئەم قۆناغە سەپاندنی بڕیارەکان بوو.

قۆناغی سێهەم: «لە دەرچونی بڕیاری (687 لە 3ی نیسانی1991) دەستپێدەکات، کە تایبەتە بە دیاریکردنی مەرجەکانی راگرتنی تەواوەتی جەنگ، لەم قۆناغەشدا جارێکی تر رۆڵ درایـەوە بە ئەنجومەنی ئاسایش بۆ بەڕێوەبردنی قەیرانەکە لە پاش وەستاندنی جەنگ»(130).

بڕیاری (687) تایبەتە بە دیاریکردنی مەرجەکانی راگرتنی جەنگ، ئەنجومەنی ئاسایش بەوپێیەی تایبەتمەندە بەو بوارە، بەرپرسیارکرا لە دیاریکردن و دەستنیشانکردنی مەرجەکان.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت، وڵاتانی هاوپەیمان پێکهاتبوو لە (33) وڵات بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا «هێزی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بریتیبوون لە ئەرجەنتین و ئوستڕالیا، بەنگلادیش، کەنەدا، چیکۆسلۆڤاکیا، دانیمارك، میسر، فەرەنسا، ئەڵمانیا، یۆنان، ئیتالیا، یابان، کوەیت، مەغریب، هۆڵندا، نیوزلەندا، نەجیریا، نەرویج، عەمان، پاکستان، پۆڵەندا، پورتوگال، قەتەر، شانشینی عەرەبی سعودیە، سەنیگال، کۆریای باشور، ئیسپانیا، سوریا، تورکیا، ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو، بەریتانیا»(131).

2.کاردانەوەی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو:

بە توندی ئەو داگیرکردنەی ئیدانەکرد و داوای پاشەکشەی

بێمەرجی عێراقی لە کوەیت کـرد. «لە پـەراوێـزی کۆبونەوەی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبیدا، وەزیرانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لە (2ی ئابی1990) ئەو داگیرکردنەیە، داوای کشانەوەی بێمەرجی سوپای عێراقی کرد بۆ شوینی بەر لە (2ی ئابی1990)، بەپێویستی زانی کە دان بەوگۆڕانکاریانەدا نەنرێت کە بەهۆی داگیرکردنەکەوە دروستبوون، سەرنجی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی راکێشا بۆ کۆبونەوەو هەڵوێستێکی یەکگرتوانەی عەرەبی بەرامبەر بە داگیرکردنی کوەیت»(132).

هەرچەندە ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لە (6) وڵات پێکدیت، بەڵام زۆر بە توندی لە بەرامبەر ئەو کردەوەیدا وەستاو هەرجۆرە هاوکارییەکی دەربڕی گەرلێی داوابکرێت بەمەبەستی ئازادکردنی کوەیت و پاشەکشەپێکردنی سوپای عێراق، رەنگە ئەم توندییەی ئەنجومەنی ناوبراو بۆئەوە بگەڕێتەوە کە وڵاتی کوەیت یەکێکە لە ئەندامە سەرەکی و کاریگەرو بەهێزەکانی ناو ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، یەکێکیش بـووە لەو وڵاتانەی ئەنجومەنی ناوبراویان پێکهێناوە.

دواجار بە هۆی نا راستی داگیرکردنی کوەیت و گوێنەدان بە بڕیارو راسپاردەکانی هەریەکە لە ئەنجومەنی ئاسایش و داواکاری وڵاتانی جیهانیو هەرێمیو عەرەبی، سەبارەت بە پاشەکشەکردن لە کوەیت، سەرئەنجام لە ماوەیەکی کەم و لە کردەوەیەکی سـەربـازیـدا، وڵاتـانـی هاوپەیمان بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، عێراق لە کوەیت وەدەرنراو گەمارۆی ئابوری سەپێنرایە سەر، لە کۆمەڵی نێودەوڵەتی دابڕاو گۆشەگیر و پەراوێزکەوت.

## بەشی سێهەم-ئاکامی جەنگی عێراق – کوەیت:

باسی یەکەم-ئاکامە ناوخۆییەکانی لەسەر عێراق- کوەیت.
باسی دوهەم -ئاکامی هەرێمیو نێودەوڵەتی.
باسی یەکەم-ئاکامە ناوخۆییەکانی لەسەر عێراق کوەیت:

**یەکەم- کاریگەری لەسەر عێراق:**

جەنگ هەرشێوە و جۆرێك بێت، سەرئەنجام وێرانکەرە و هۆی بەرپابوونی کاولکردنی ئاوەدانیەکانە، بکوژی مرۆڤایەتییە، دەبێتە هۆکاری داتەپینی ژێرخانی ئابوری وڵاتو پەکخستنی کاروانی زانست و تەکنەلۆژیا.

جەنگی دووەمی کەنداو، یاخود داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە، کۆمەڵێك ئاکامی ئابوری و مرۆیی و کۆمەڵایەتی لێدروستبوو، کە هێندەیتر باری سەرشانی هاوڵاتیانی عێراقییان گرانترو ئەستەمتر کرد.

**•ئاکامی ئابوری:**

ئەوجەنگە زیانێکی گەورەی بە ژێرخانی ئابوری عێراق گەیاند، لە تەواوی بوارەکانی بازرگانیو پیشەسازی تا دەگاتە زیادبونی قەرزە کەڵەکەبووەکان. «بەهۆی سەپاندنی گەمارۆی ئابوری بەسەر عێراقدا، رێژەی هاوردە بۆ (97%  بۆ 90%) دابەزی»(133).

ئەوەی لە جەنگدا زیانی گەورەی بەردەکەوێت، دامـەزراوەی خزمەتگوزاریو رێگاوبانو قوتابخانەکان بوو، تێچونەکەی دەگەیشتە (190) ملیار دۆلار، زیانە داراییو ئابوریەکان هێندە زۆربوون، (جیمس بیکەر) بە (تارق عەزیز)ی وەزیری دەرەوەی عێراقی وتبوو، بەم جەنگە دەگەڕێنەوە بۆسەردەمی بەر لەشۆرشی پیشەسازی»(134).

جەنگ هاوڵاتیانی عێراقی بەرەو هەژاریو بێکاری برد، بە جۆرێك کاریگەری خراپی لەسەر دەروونی زۆرینەی عێراقییەکان دروستکردبوو، «لە ساڵی (1991)، لە بەغداد (120) هەزار تاکسی تۆمارکرابوو، لە کاتێکدا لە بەرلین تەنها شەش هەزار تەکسی بە رەسمی تۆمارکرابوو، ئەوەی عێراق دەگەڕێتەوە بۆئەوەی باروگوزەرانی خەڵکی باش نییە و بەکارهێنانی تاکسی وەك سەرچاوەیەکی ترە بۆ دابینکردنی بژێوی رۆژانە»(135).

**•ئاكامی مرۆیی:**

لە جەنگی دووەمی کەنداودا، گەورەتین زیانی گیانیو مرۆیی بە عێراق کەوت، خوێناویترین تۆماری مێژووی جەنگ بوو لە پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە، «لە ئاکامی جەنگەکەدا سوپای عێراق (100) هەزار کوژراو و (300) هەزار برینداری هەبوو، جگەلەوەی (2300) مەدەنی لە سێدارە درابوون»(136).

**•ئاکامی رامیاری:**

بە هۆی نەپەرژانی حکومەتی عێراقی بە چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانەوە، بێزاربوونی زۆرینەی سەربازانی سوپای عێراقی، هێزو گروپە سیاسییەکان لە هەرێمی کوردستان لە (5ی ئازاری 1991) راپەرینیان دەستپێکرد و لە (21ی ئازار)دا بە رزگارکردنی کەرکوك تەواوی کوردستانی عێراق کەوتە ژێردەسەلاتی هێزە کوردییەکان، کە بـووە سەرەتای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، «پاش ئەوەی جەنگ لە (28ی شوباتی1991)دا لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە وەستێنرا، بزووتنەوەی سیاسی کوردستان بانگەوازی بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کرد تاپێکەوە راپەرین بکەن»(137).

لە باشوری عێراقیش هاوڵاتیان راپەڕین و خۆپیشاندانیان دژ بـە حکومەتی عـێـراق و سـەدام حسێنی سـەرۆك کۆمار ئەنجامدا،»ئاژانسەکانی دەنگوباسی دنیا ئاماژەیانکرد بۆئەوەی لە باشوری عێراق راپەڕینێکی جەماوەری دژ بەڕژێم و حکومەت بەرپابووە بە تایبەتی لە شاری بەسرە، کە سەرەتا بە تەقاندنەوەی بۆمبێك لەلایەن سەربازێکەوە لە تانکەکەی خۆیەوە بەرامبەر بە وێنەیەکی سەدام حسێن، پاشان زۆرێك لە سەرباز و فەرماندە و ئەفسەران بەشدارییان تێداکرد و دواتر جەماوەر لە گەڵیاندا هێرشیان بردە سەردام و دەزگا هەواڵگریو حکومییەکان»(138).

**دوهەم- کاریگەری لەسەر کوەیت:**

لە بەرئەوەی کوەیت هێرشی کراوەتەسەر و داگیرکراوە، زیانی گەورەی لێکەوێت، بە پێی «فەرهەنگی و یکبیدیا»(139)، زیانەکان و ئاکامەکانی جەنگەکە لەسەر کوەیت بریتیبوون لە:

•سوتاندنی (737) بیری نەوت لەلایەن سوپای عێراقەوە.

•بڵاوبونەوەی هەزاران تەن لە دوکەڵ کە نەك کاریگەری لەسەر کوەیت هەبوو، بەڵکە کاریگەرە نێگەتیڤەکانی گەیشتە وڵاتانی تری کەنداو.

•دروستکردنی مەترسی و پیسکردنی ژینگەی ناوچەکە.

•بە تاڵانبردنی سەروەت و سامانی حکومەت و هاوڵاتیانی کوەیتی.

•تێکدانی ژینگە و کەمبونەوەی باران کە بە تەواوی کشتوکاڵیان لەو وڵاتە لەناوبرد.

•پیسبوونی ژینگە گەورەترین هەڕەشە و مەترسی بوو لەسەر تەندروستی و ژیانی دانیشتوان بە گشتی و منداڵ و پیرەکان بە تایبەتی.

•پیسکردنی دەریا و ئاوەکانی کوەیت و ناوچەکە بە نەوت.

•توشبوونی ژمارەیەك هاوڵاتی کوەیتی بە نەخۆشی جۆرە جیاوازەکانی شێرپەنجە.

•لە جەنگی ئازادکردنی کوەیتدا (1) سەربازی کوەیتی کوژراوە.

**باسی دوهەم - ئاکامی هەرێمی و نێودەوڵەتی**

جەنگی دووەمی کەنداو، بووە هۆی دروستبوونی چەندین ئاکام و کاریگەری لەسەر سیستمی نێودەوڵەتی و بارودۆخی سیاسی و ئابوری ناوچەکە و گۆڕانکاری لە سیستمی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا. لەوانە:

•لە (2ی ئابی1990) تاروخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ئۆکتۆبەری

(1991)دا، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی تەواوی سەرنج و چاودێرییەکانی، کەوتبووە سەر جەنگی دووەمی کەنداو(140).

•جەنگی دووەمی کەنداو، توانی گۆڕوتێنێکی کاریگەر بدات بە پێداچونەوە و نوێکردنەوەی سیستمی نێودەوڵەتیو کارکردن بە پرەنسیپی هاوسەنگی هێزەکان، تاجارێکی تر کارەساتی هاوشێوەی داگیرکردنی کوەیت دووبارە نەبێتەوە(141).

•بە هۆی جەنگی دووەمی کەنداوەوە، هێزی سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، توانی لە ساڵی (1991)دا بە دواوە تائێستا بە بەردەوامی بنکە و پێگەی سەربازی خۆی لە ناوچەی کەنداو جێبکاتەوە، کە ناوچەیەکی هەستیار و کاریگەرە لەلای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، تەنها لە کاتی جەنگەکەدا (350000) سەربازی ئەمەریکی لە ناوچەکەدابوو، بەدەر لە فڕۆکە، کەشتی، ئامێر و چەکی سەربازی(142).

•کۆدەنگییەکی جیهانی لە ناوەندە سیاسی و دبلۆماسیەکاندا بەرامبەر سەپاندنی گەمارۆی ئابوری بەسەر عێراقدا دروستبوو، بە جۆرێك کەمترین ژمـارەی دەوڵەتان هەوڵیاندەدا بۆ لابـردن و کەمکردنەوەی ئەوگەمارۆیە، لەسەر عێراقییەکان، چونکە سەدام حسێن و دار و دەستەکەی کاریگەری گەمارۆیان پێوە دیارنەبوو.

•وڵاتانی ناوچەکە بە گشتی و کەنداو بە تایبەتی، سنورەکانیان واڵاکرد بۆ هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی، تاپارێزگارییان لێبکەن لە پەلاماردانی سەدام. ئەمەش جارێکی تر زەمینەی زیادبون و مانەوەی هێزەکانی ئەمەریکای لەناوچەکە رەخساند.

•بە هۆی جەنگەکە و دواتر سەپاندنی گەمارۆی ئابوری، بڕێك پـارەی زۆری عێراق، کە لە بانکەکانی دەرەوەبــوون بلۆك کرانو دەستیان بەسەرداگیرا.

•عێراق رێگەی لێگیرا، بۆخۆی مامەڵەی فرۆشتنی نەوت بکات،

ئەمەش بوەهۆی بەرزبونەوەی نرخی نەوتی خاو لە بازاڕەکانی جیهاندا، بۆیە وڵاتانی کەنداو ئەرکی زیادکردنی بەرهەمهێنانی نەوتیان کەوتە سەرشان، تاڕێژەکە بگەیەننە بەر لە (2ی ئابی1990)، بەو هۆیەوە نرخی نەوتی خاو دابەزێت.

•بۆ هەڵوێست وەرگرتن لە بەرامبەر داگیرکردنی کوەیتدا، وڵاتانی ناوچەکە جۆرێك دابەشبوون و جیابوونەوەیان بەخۆوەدی، بە گشتی وڵاتانی عەرەبی دابەشبوون بەسەر دوو گروپدا، گروپی یەکەم، بە توندی دژی داگیرکردنەکە وەستاو لە (13) وڵات پێکهاتبوو، گروپی دووەم، گروپێکی لاوازبوون لە رووی ژمارە و ئابوری و کاریگەرییەوە، بە سەرۆکایەتی عێراق(143).

## دەرئەنجام

ئامانجی هەرتوێژینەوە و بە دواداچونێك، گەیشتنە بە کۆمەڵێك دەرئەنجام، بە جۆرێك کە بتوانێت یارمەتی دەربێت لە زیادکردنی زانیاری لەسەر ئەوبابەتەی توێژینەوەکەی لەسەر ئەنجامدراوە. لەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

•جەنگ پرۆسەیەکی توندوتیژییە، لایەنێك بەرامبەر بە لایەنێکی تر بەکاری دەهێنێت، بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو، یان ناچارکردنی بەرامبەر بە خواستەکانی گروپی بەرپاکەری جەنگ.

•جەنگ بە چەندین شێواز و جۆری جیاواز لە یەکتری بەڕێوەدەچێت، کە تایبەتمەندی کات، شوێن، ئامانج، میکانیزمی جەنگ، رۆڵیان دەبێت لە جۆرەکانی جەنگدا، وەك سەربازی، ئابوری، دەرونی، ئاینی، ناوخۆیی، تەکنەلۆژی.

•هەرکردەوەیەك، ژمارەیەك فاکتەرو میکانیزم رۆڵیان لە بەرپابونیدا هەیە، جەنگیش وەك هەر دیاردە و روداوێکی تر، فاکتەری ئابوری، سیاسی، ئاینی، زانستی و تەکنەلۆژی، کۆمەڵایەتی،

کەلتوری، رۆڵ و کاریگەرییان لەبەرپابوون و هەڵگیرساندنی جەنگدا هەیە.

•بەوپێیەی شێواز و میکانیزمو هۆکارو ئامانجی جیاواز لە یەکتر لە بەرپابونی جەنگدا، رۆڵو بەشداریو کاریگەرییان هەیە، بە هەمانشێوە دەرئەنجامی جیاوازی بە پێی تایبەتمەندیەکانی بەرپابوونی لێدەکەوێتەوە.

•داگیرکردنی کوەیت، یاخود جەنگی دووەمـی کەنداو، بە کارەساتی جەنگ دادەنرێت لە پاش جەنگی دووەمـی کەنداو، جەنگێك بوو بێبنەماو هۆکارێکی لۆجیکی.

•ژمارەیەك هۆکاری جیۆپۆلەتیکی، ئابوری، رامیاری رۆڵیان لە بەرپابونی جەنگدا هەبوو. بە هەمانشێوە کاریگەری و دەرئەنجامەکانی جەنگەکە جیاوازبوو، بـەڵام زۆرترین رێژەی قوربانیو کارەسات و قـەرزداری بۆ گەلانی عێراق لێکەوتەوە، بە جۆرێك لە ئێستادا حکومەتی عێراق کە لە پاش رووخـان و لەناوچونی سەدام حسێن، بە هەڵبژاردن هاتۆتە سەرکار، بەڵام مەرجدارە بە وەی برێك لەو قەرزانە بداتەوە کە بە هۆی جەنگی دووەمی کەنداوەوە لەسەر حکومەتی ئەوکاتی عێراق کەڵەکە ببوو، ئەگەرچی بـەردەوام هەوڵ هەیە بۆلێخۆشبوونی وڵاتانی خاوەن قەرز لەو قەرزانەیان کە لای عێراقە.

•سەبارەت بە داگیرکردنی کوەیت، پاشەکشەپێکردنی عێراق لە کوەیت، هێرشی سەربازی بۆ سەر هێزەکانی عێراق، سەپاندنی سزاو گەمارۆ بۆ سەر عێراق، ئەنجومەنی ئاسایشی سەربە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان وەك لایەنی بەرپرس لە دابینکردنی هاوسەنگی هێزو ئاشتیو ئاسایش، ژمارەیەك بریاری دەرکرد، بۆ نمونە بریاری ژمارە (660-661-662-664-666-667-670-674-677-678-687).

## پەراوێزەکان:

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ، وەرگێڕانی: مەنسور تەیفوری، لەبڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕانی وەزارەتی رۆشنبیری, چاپی یەکەم، 2006، ل5-6.

(*)Ramayana: حەماسەی پیرۆزی هندو لەسەدەی پێنجەمی پێش زایینو سەدەی پانزدەهەمی دوای زاییندا وتراوەو سەربوردەی پاشایەکە بە ناوی راما.

(**) Indra: مەزنترین، خوای هەورەبرووسکە و شەڕخوازی.

(***) Mithra: خوای بچوکی گەورەی فریشتەکانی توخمەکانی سروشت و دادوەری مردووەکان.

(****) Varouna: خودای ئاسمانە و لە ئەفسانەی هنددا پلەیەکی وەك میترای هەیە.

(*****) Brahma: خودای هندی و بەدیهێنەری جیهان، خواو بوونەوەرەکانە.

(******) خوای پارێزەری جیهانە و جارجار لە شێوەی مرۆڤدا دەردەکەوێت.

(*******) Kali: هاوسەری شیواو خوای بچوکی مەرگ.

(*)Zeus: خوای مەزنی یۆنانی، کوڕی کرونوس و پرمئا، خوای هەورە برووسکە.

(**)Titans: کوڕەکانی ئۆرانۆس، ئەوان هەوڵیاندەدا کێوەکان لەسەر یەك هەڵبچنن‌و ئاسمان داگیر بکەن.

(***)Tiphee: خوا گچکەی باوەروتی ئەستێرەکان.

(****)Cgronos: باوکی زیۆسی خوای هەورە برووسکە.

(*****)Ophionee: ئەو دێوەیە  بە دەستی ساتۆرن کوژرا.

(******)Mars: کەسایەتی ئوستوورەیی رۆمی، خوای جەنگ وکشتوکاڵ.

(*******)Pallas: ئوستوورەی یۆنانی، دێو، نازناوی ئاتینا.

گاستۆن بۆتۆل : کۆمەڵناسی جەنگ، ل7.

گاستۆن بۆتۆل : هەمان سەرچاوە، ل7-8.

مایکل هۆوارد: کارل فۆن کلاوزەڤتز، وەرگێڕانی لەفارسیەوە: کەمال رەشید شەریف، ژمارەی سپاردن (242)، لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی، ن، ك)، ساڵی 2006، ل81.

مایکل هۆوارد: هەمان سەرچاوە، ل34.

مایکل هۆوارد: سەرچاوەی پێشوو، ل43.

مایکل هۆوارد: هەمان سەرچاوە ، ل43.

ڕێبین ئەحمەد هەردی: شەر، حزب سڕینەوەی کۆمەڵگەی شارستانی، گۆڤاری (رەهەند)، ژمارە یەك، 1996، ل7.

هەمان سەرچاوە، ل7.

مایکل هۆڤارد: سەرچاوەی پێشوو، ل49.

گاستۆن بۆتۆل: جەنگ ناسی، ل33.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ، ، ل11.

(*)Heraclites (540 ـ 480 پ. ز) فەیلەسووفیکی یۆنانی.

(**)Cité.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، ل11-12.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، هەمان سەرچاوەل 12..

هەمان سەرچاوە، ل13.

گاستۆن بۆتۆل: گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، ، ل22.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، ل23.

(*)Gabriel de Tarde (1843- 1904) کۆمەڵناسی فەرەنسی.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، ل 23.

گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ ، ل32.

الجنرال کارل فون کلاوزەڤیتز: الوجیز فی الحرب، ل141.

سۆن تزۆ: هونەری جەنگ، وەرگێرانی: رووف حسن، لەبڵاو کراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، 2004، ل23.

الجنرال كارل فون كلاوزەڤيتز: الوجيز فی الحرب، ل75.

الغرب والعالم (قسم الاول ) ، تاريخ الحضارات من خلال موضوعات ، تاليف كافين رالی ، ترجمة: د. عبدالوهاب محمد المسيری و د. هدی عبدالسميع الحجازی ،سلسلة كتب ثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطنی للثقافة والفنون والاداب –كويت ، يونيو 1985 ، ص 123.

الدكتور كاظم هاشم نعمة: العلاقات الدولية، وزارة التعليم العالی والبحث العلمی، جامعة بغداد، كلية العلوم السياسة، 1987، بغداد، ص148.

هەمان سەرچاوە، ل149.

جەنگ و دژە جەنگ، نوسينی ئيلڤن تۆفلەر و هايدی تۆفلەر، وەرگێڕانی بۆفارسی شهيندفت خوارزمی، نشر، سيمر، چاپخانە، مهارات، چاپی 3، وەرگێڕانی بۆكوردی ئەكرەم ئەحمەد، ــ دەست خەت ــ .

لواو دكتور احمد انور زهران: العالم والحرب، مطابع الاهرام التجاريە، ص11.

د.محمد محمد صالح: محاچرات تطورات الاراو القوميە فی اوروبا، كليە الاداب، جامعە بغداد، ص74.

هەمان سەرچاوە، ل80.

هەمان سەرچاوە، ل81.

لواو دكتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص 11.

لواودكتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص 12.

هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ئيلڤن تۆفلەرو هايدی تۆفلەر: جەنگو دژە جەنگ، ــ دەستنوس ــ .

د. موسا ابراهيم: فاشيزمو نازيزم، وەرگيرانی: شوان ئەحمەد، گۆڤاری (سەردەم)، ژمارە (20)، نيسانی 2002، ل68.

هەمان سەرچاوە، ل71-72 .

(*)(1758 1794-Robespierre) سياسەتوانی فەرەنسیو ئەندامی ليژنەی رزگاری نەتەوەيی. لە بيستو حەوتی پ،.حوزەيرانی 179 لە سێدارە درا.

(**)Convention ئەنجومەنی شۆڕشگێڕی كە لە بيستويەكی 1792، لە

بری ئەنجومەنی یاسادانان دانرا و تا بیست و شەشی ئۆکتبری 1795 لە فەڕەنسا خەریکی کاری خۆی واتە یاسادانان بوو.

گاستۆن بۆتۆل: سەرچاوەی پێشوو، ل105.

ئیلڤن تۆفلەرو هایدی تۆفلەر: سەرچاوەی پێشوو.

ئیریك ئارنیت: دورنمای هەڵسەنگاندنی هەڕەشەکان- هەڵسەنگاندنی توانای سوپایی و ئەگەری سەرهەڵدانی جەنگ لە باشوری ئاسیا (ئێران، پاکستان، هندستان‌و چین)، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە: شاسوار حسێن ، گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی)، ژمارە (46)، مایسی 2005، ساڵی سیانزەهەم، ل244.

گاستۆن بۆتۆل: سەرچاوەی پێشوو، ل 54..

گاستۆن بۆتۆل: سەرچاوەی پێشوو، ل54.

لواو دکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص12.

لواو دکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص13.

لواو دکتور احمد انور زهران: هەمان سەرچاوە، ل13.

لواو دکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص12.

غسان العزی: سیاسه القوه- مستقبل النظام الدولی والقوی العظمی، مرکز الدراسات الاستراتیجیه والبحوث والتوثیق، الطبعه الاولی، بیروت، 2000، ص97.

هەمان سەرچاوە، ل96.

غسان العزی: سەرچاوەی پێشوو، ل96.

لواو دکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص15.

رەفیق سابیر: ئیمپراتۆریای لم- دەربارەی ئیسلام- خێڵو ناسیۆنالیزم، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، ل11.

رەفیق سابیر: سەرچاوەی پێشوو، ل11-12.

هەمان سەرچاوە، ل166.

رەفیق سابیر: سەرچاوەی پێشوو، ل166.

هەمان سەرچاوە، ل180.

فەرید ئەسەسەرد: ئایینو مەسەلەکانی دیموکراسیو ئینتەرناسیۆنالیزم، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ساڵی 2003، سلێمانی، ل9-10.

فرانسیس فوکویاما: نهایه التاریخ والانسان الاخیر، ترجمه: د.فۆاد شاهین ود.جمیل قاسم ورچا الشایبی، مرکز الانماء القومی، لبنان، بیروت، 1993، طبعه الاولی، ص71.

کۆمەڵێك نوسەر: دیالۆگ، وەرگێڕانی لەفارسیەوە: کـارزان محمد، لەبڵاوکراوەکانی خانەی قانع، ساڵی2005، چاپی یەکەم، ل45.

جۆن لۆك: نامەیەك دەربارەی لێکبوردن، وەرگێرانی: شۆرش جوانڕۆیی-فەرشید ئەشرەفی، لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ساڵی2004، ل18.

جۆن لۆك: سەرچاوەی پێشوو، ل15.

ا.د.زینب عبدالعزیز: حرب صلیبیه بکل المقاییس، دار الکتاب العربی، دمشق-قاهره، الطبعه الاولی، 2003، ص89.

ا.د.زینب عبدالعزیز: هەمان سەرچاوە، ل90.

د. کەمال مەزهەر: ڕێنسانس لەگەڵ باسێکی تر بەناوی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری، بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، چاپی دووهەم، 2003، چاپخانەی شڤان، سلێمانی،ل3.

هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل4.

دکتور سامی عصاصه: هل الیهودیه التلمودیه الدین؟، الطبعه الثانیه، 1998، ص92.

نەریمان کەرکوکی: کەمینە نەتەوەییو ئاینیو مەزهەبییەکانی کوردستان، گۆڤاری بیروهۆشیاری، بڵاوکراوەی مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، ژمارە (3) ، تشرینی یەکەمی 2002، سلێمانی، ل98.

د.موسا ابراهیم: فیکری سیاسی خۆرئاوا لەمەکیاڤیلی یەوە تامارکس،

وەرگێڕانی: شوان ئەحمەد، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، 2005، سلێمانی، ل349.

جەودەت ئیسماعیل لوتفیو سیروان عارف: ناسیۆنالیزمو کەمینەکان لەسیاسەتی نێودەوڵەتاندا، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی.ن.ك)، 2002، سلێمانی، ل 11.

هەمان سەرچاوە، ل11.

ادوارد مید ایرل واخرین: رواد الاستراتیجیه الحدیثه، ترجمه وتقدیم: العمید ارکان الحرب محمد عبدالفتاح ابراهیم، مکتبه النهظه المصریه، سنه 1962، ص161.

نفس المصدر، ص163 .

ادوارد مید ایرل واخرین: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

هەمان سەرچاوە، ل23.

هەمان سەرچاوە ،ل 25.

سۆن تزۆ: هونەریجەنگ، و: رووف حسن، لەبڵاو کراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، ساڵی2004، ل197.

ادوارد مید ایرل واخرین: سەرچاوەی پێشوو، ص363.

هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل367.

لواودکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص23 .

لواودکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ل64.

لواودکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص35.

رائد الطیران جاسم محمد البصیلی: الحرب الاکترونیه اسسها واثرها فی الحروب، المؤسسه العربیه للدراسات والنشر، الطبعه الپانیه، 1989، بیروت، ص30.

رائد الطیران جاسم محمد البصیلی: هەمان سەرچاوە، ل31.

رائد الطیران جاسم محمد: سەرچاوەی پێشوو، ص41.

د.حکمت تۆفیق فکرتو بەختیارزهدیو بەرزان عبدالله: جەنگی کیمیاییو

بایۆلۆژی، بڵاوکراوەکانی ئازادیی کوردستان، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، 1997، ل41.

د.حکمت تۆفیق فکرتو بەختیارزهدیو بەرزان عبدالله: هەمان سەرچاوە، ل43.

بەختیار عەلی: چۆن پاکێتیمان دۆڕاند، گۆڤاری (هزر)، ژمارە (1)، هاوینی 1998، ل58.

بەختیار عەلی: هەمان سەرچاوە، ل71.

تشی غیڤارا: حرب الغوار، ترجمه: د.فۆاد ایوب وعلی الگود، منشورات دارالفارابی، بیروت-لبنان، الطبعه الاولی، 1998، ص14.

د.موسا ابراهیم: فیکری سیاسی خۆرئاوا لەمەکیاڤیلی یەوە تامارکس، وەرگێڕانی: شـوان ئەحمەد، دەزگـای چـاپو پەخشی سەردەم،چاپی یەکەم،2005، سلێمانی، ل65.

هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل49.

لواودکتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص127.

د. فخری الدباغ: الحرب النفسیه، موسوعه صغیره (38)، منشورات وزاره الثقافه والفنون، 1979، ص3.

پرۆفیسۆر مایکل ماندلبۆم: ئەوئایدیایانەی کەدەستیان بەسەر جیهانداگرت، وەرگێڕانی گۆران سەباح غەفور،ژمارەی سپاردن 690، زنجیره کتێبی دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی ژمارە ـ89(192) ـ چاپی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ،2006، ل 20.

پرۆفیسۆر مایکل ماندلبۆم: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

ارثر مار ویك: الحرب والتحول الاجتماعی فی القرن العشرین، ترجمه: سمیر عبدالرحیم الچلبی، دار المامون، طبع بدار الحریه فی بغداد،1990، ص20.

ژنان قوربانی یەکەمی دەستی جەنگن: رۆژنامەی راسان، بڵاوکراوەی ڕێکخراوی راسان، ژمارە (59)، کانونی دووهەمی 2007، سلێمانی، دوالاپەرە ل8.

لواو دكتور احمد انور زهران: سەرچاوەی پێشوو، ص127.

گاستۆن بوتول ـ ئانتۆنی گدینز ـ د.حسێن بەشیریە: کۆمەڵناسی شەر، وەرگێڕانی: عومەر باڵەکی، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، 2005، سلێمانی، ل45.

گاستۆن بوتول ـ ئانتۆنی گدینز ـ د.حسێن بەشیریە: کۆمەڵناسی شەر، ل98.

دکتۆر سالار باسیرە: جەنگی دوهەمی کەنداو هۆو ئامانجەکانی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، ژمارە 37، 2002، بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، ل52.

د.فتوح الخترس والاخرین: الغزو العراقی للکویت (ندوە بحثیە)، مجلس الوطنی للثقافە والفنون والاداب-کویت، سلسلە (195)، مارس1995، ص47.

د.ئــەوانو ئەندرسنو د.خەلیل هــ.رەشیدیان: عێراقو بەردەوامی قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەراست، وەرگێڕانی: فوئادی تاهیر سادق، زنجرە (70)ی بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان،چاپخانەی رون، سلێمانی،ساڵی2004، ل201.

ریاض العطار: دراســات وموضوعات عامە فی شان حقوق الانسان، مطبوعات مدیریە العامە للطباعە والنشر تسلسل، الطبعە الثانیە، مطبعە ژین، سلیمانیە، 2002، ص15.

ریاض العطار: سەرچاوەی پێشوو، ل 17.

د. فتوح الخترس والاخرین: سەرچاوەی پێشوو، ص 52.

د. فتوح الخترس والاخرین: سەرچاوەی پێشوو، ل54.

هەمان سەرچاوە، ل 59.

د.سالارحمە سور باسیرە: سەرچاوەی پێشوو، ل44.

د.فتوح الخترس والاخرین: سەرچاوەی پێشوو، ص47.

د. ئەوان و. ئەندرسن ود. خەلیل هـ.رەشیدیان: سەرچاوەی پێشوو، ل193.

د.محمد فاضل الجمالی: ماساه الخليج والهيمنه الغربيه الجديده، مكتبه متدبولی، 1992، ص16.

د.نبيل السمان: امريكا وخفايا حرب الخليج من كارتر الى بوش، دائره المكتبات والوثائق الوطنيه عمان، الطبعه الثانيه، 1991، ص78.

موسوعه ويكبيديا، حرب الخليج الثانيه،((www.mawsoah.net،global) arbic encyclopedia .

هەمان سەرچاوە.

د. سالارحمه سور باسيره: سەرچاوەی پێشوو، ل52.

د. محمد فاضل الجمالی: سەرچاوەی پێشوو، ص16-17.

د. فتوح الخترس والاخرين : سەرچاوەی پێشوو، ص 102.

د.مكرم الطالبانی : الحرب هل كانت الخيار الاوحد لحل ازمه الكويت؟،سللسله كتب الثقافيه لدار ئاراس للطباعه والنشر، اربيل ،الطبعه الاولى ،2006،ص 22-23.

د. فتوح الخترس والاخرين : سەرچاوەی پێشوو، ص 105.

د. سالارحمه سور باسيره: سەرچاوەی پێشوو، ل 45.

د.مكرم الطالبانی: سەرچاوەی پێشوو، ص 13.

د. فتوح الخترس والاخرين: سەرچاوەی پێشوو، ص 161.

د.محمد السيد سعيد:مستقبل النظام العربی بعد ازمه الخليج، مجلس الوطنی للثقافه والفنون والا داب –كويت ،سلسله 1992،158،ص 9.

د. ئەوانو ئەندرسنو د. خەليل هـرەشيديان: سەرچاوەی پێشوو، ل208.

هەمان سەرچاوەی، ل195.

هەمان سەرچاوە، ل 194.

لواودكتور احمد انور زهران : سەرچاوەی پێشوو، ص 150-151.

ميثاق الامم المتحده .

د.حسن النافعه: الامم المتحده فى نصف القرن،،مجلس الوطنى للثقافه والفنون والا داب –كويت ،سلسله1995،202،ص 304.

هەمان سەرچاوە، ل304.

هەمان سەرچاوە، ل304.

موسوعه ويكبيديا،حرب الخليج الثانيه،((www.mawsoah.net،global . arbic encyclopedia

موسوعه ويكبيديا،حرب الخليج الثانيه،((www.mawsoah.net،global . arbic encyclopedia

رياض العطار: دراسات وموضوعات عامه فى شان حقوق الانسان، مطبوعات مديريه العامه للطباعه والنشر، الطبعه الثانيه، 2002، مطبعه ژين، سليمانيه، ص18.

هەمان سەرچاوە، ل 18.

د. سالارحمه سور باسيره: سەرچاوەی پێشوو، ل51.

موسوعه ويكبيديا،حرب الخليج الثانيه،((www.mawsoah.net،global . arbic encyclopedia

العميد الركن نجيب الصالحى:الزلزال ماذا حدث فى العراق بعد الانسحاب من لكويت،مطبعه خاك،السليمانيه، ص255.

هەمان سەرچاوەی، ل255.

موسوعه ويكبيديا،حرب الخليج الثانيه،((www.mawsoah.net،global . arbic encyclopedia

د.فتوح الخترس والاخرين: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل664.

هەمان سەرچاوە، ل665.

لواودكتور احمد انور زهران: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص 159.

د.محمد السيد سعيد: مستقبل النظام العربى بعد ازمه الخليج، مجلس الوطنى للثقافه والفنون والا داب –كويت، 1992، ص90.

## سەرچاوەکان

**یەکەم- کتێبە کوردییەکان:**


1.ئیلڤن تۆفلەر و هایدی تۆفلەر: جەنگ و دژە جەنگ، وەرگێڕانی بۆ فارسی: شهیندفت خوارزمی، نشر سیمر، چاپخانە مهارات، چاپی3، وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئەکرەم ئەحمەد،-دەستنوس- .گاستۆن بۆتۆل: جەنگ ناسی، وەرگێڕانی: مەنسور تەیفوری، لەبڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕانی وەزارەتی رۆشنبیری، 2005.

2.د. ئـەوان و. ئەندرسن ود. خەلیل هـ .رەشیدیان :عێراق و بەردەوامی قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەراست، وەرگێڕانی فوئادی تاهیر سادق، زنجرە (70) ی بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان ،ژمارەی سپاردن (407) ،چاپخانەی روون، سلێمانی، ساڵی 2004 .

3.جـۆن لـۆك: نامەیەك دەربـاەی لێکبوردن، وەرگێڕانی شۆڕش جوانڕۆیی- فەرشید ئەشرەفی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان زنجیرە (32)، ژمارەی سپاردن 35/ی ساڵی 2004، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ساڵی 2004.

4.جــودەت ئیسماعیل لوتفی و سیروان عـارف: ناسیۆنالیزم و کەمینەکان لە سیاسەتی نێودەوڵەتاندا، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) زنجیرە4، ژمـارەی سپاردن (357)، 2002، سلێمانی .

5.د. حکمت تۆفیق فکرت: بەختیار زهدیـ بەرزان عبدالله، جەنگی کیمیایی و بایۆلۆژی، بڵاوکراوەکانی ئازادیی کوردستان، ژمارەی سپاردن 44،1997، چاپخانەی تیشك، سلێمانی.

6.رەفیق سابیر: ئیمپراتۆریای لم، دەربارەی ئیسلام، خێڵ و ناسیۆنالیزم، ژمارەی سپاردن (397ی 2002) لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم زنجیرەی(186).

7.سۆن تزۆ: هونەری جەنگ، وەرگێڕانی: رووف حسن، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، ساڵی 2004.
8.فەرید ئەسەسەرد، ئایین و مەسەلەکانی دیموکراسی و ئینتەر ناسیۆنالیزم، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، زنجیرە (24)، ساڵی 2003، سلێمانی.
9.د. کەمال مەزهەر، رێنسانس لەگەڵ باسێکی تر بە ناوی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ، وەرگێڕانی شۆرش فوئاد مەجید میسری، بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، چاپی دووهەم، 2003، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.
10.کۆمەڵێك نوسەر، دیالۆگ، وەرگێڕانی لە فارسییەوە کارزان محمد، لە بڵاوکراوەکانی خانەی قانع زنجیرە (25) ژمارەی سپاردنی 916ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی 2005، چاپی یەکەم.
11.گاستۆن بوتول و ئانتۆنی گدینز و د.حسێن بەشیریە: کۆمەڵناسی شەڕ، وەرگێڕانی: عومەر باڵەکی، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، سلێمانی، 2005.
12.گاستۆن بۆتۆل: کۆمەڵناسی جەنگ، وەرگێڕانی: مەنسور تەیفوری، لە بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕانی وەزارەتی رۆشنبیری, چاپی یەکەم، ساڵی 2006.
13.مایکل هۆواردو کارل فۆن کلاوزەڤتز: وەرگێڕانی: لە فارسییەوە کەمال رەشید شەریف، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی،ن،ك)، ساڵی 2006.
14.پرۆفیسۆر مایکل ماندلبۆم، ئەوئایدیایانەی کە دەستیان بەسەر جیهانداگرت، وەرگێڕانی گۆران سەباح غەفور، ژمارەی سپاردن 690، زنجیرە کتێبی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی ژمارە ـ 89 (192) ـ چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، 2006.

**دووهەم- بەزمانی عەرەبی:**

15. ادوارد ميد ايرل واخرين،رواد الاستراتيجية الحديثة،ترجمة وتقديم العميد اركان الحرب محمد عبدالفتاح ابراهيم،مكتبة النهضة المصرية ،سنة 1962 .

16. لواءدكتور احمد انور زهران ، العالم والحرب ،مطابع الاهرام التجارية .

17. تشى غيظارا ،حرب الغوار،ترجمة د.فؤاد ايوب وعلى الطود،منشورات دارالفارابي ،بيروت ،لبنان ،الطبعة الاولى ،1998.

18. رائد الطيران جاسم محمد البصيلى ،الحرب الاكترونية اسسها واثرها فى الحروب ،المؤسسة العربية للدراسات والنشر،الطبعة الثانية ،1989 ،بيروت .

19. .د.حسن النافعة: الامم المتحدة فى نصف القرن،،مجلس الوطنى للثقافة والفنون والا داب –كويت ،سلسلة1995،202.

20. رياض العطار :دراسـات وموضوعات عامة فى شان حقوق الانسان ،مطبوعات مديرية العامة للطباعة والنشر تسلسل (41)،رقم الايداع (456 لسنة 2002) ،الطبعة الثانية ،2002، مطبعة ذين ،سليمانية .

21. ا.د. زينب عبدالعزيز:حرب صليبية بكل المقاييس ،دار الكتاب العربي ،دمشق-قاهرة الطبعة الاولي 2003.

22. دكتور سامى عصاصة:هل اليهودية التلمودية الدين؟ ،الطبعة الثانية،1998.

23. فرانسيس فوكوياما :نهاية التاريخ والانسان الاخير، ترجمة د.فؤاد شاهين،د. جميل قاسم،رضا الشايبى ،مركز الانماء القومى ،لبنان ،بيروت،1993،طبعة الاولى .

24. د. فتوح الخترس والاخرين :الغزوالعراقى للكويت (ندوة بحثية) ،مجلس الوطنى للثقافة والفنون والا داب –كويت ،سلسلة (195) ،مارس 1995.

25. . د. فخرى الدباغ :الحرب النفسية ،موسوعة صغيرة (38)،منشورات وزارةالثقافة والفنون،1979 .

26. الجنرالكارل فون كلاوزەڤيتز : الوجيز فى الحرب ،ترجمة اكرم ديرى و الهيثم الايوبى ،المؤسسة العربية للدراسات والنشر ،لبنان ،بيروت ،1974.

27. كافين رالى : الغرب والعالم (قسم الاول ) ،تاريخ الحضارات من خلال موضوعات ،ترجمة د. عبدالوهاب محمد المسيرى و د. هدى عبدالسميع الحجازى ،سلسلة كتبثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطنى للثقافة والفنون والاداب –كويت ،يونيو 1985 .
28. الدكتور كاضم هاشم نعمة : العلاقات الدولية ، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى ،جامعة بغداد ،كلية العلوم السياسة ، 1987 ،بغداد .
29. د. محمد فاضل الجمالى :ماساة الخليج والهيمنة الغربية الجديدة،،مكتبة متدبولى ،1992 .
30. دمحمد محمد صالح :محاضرات تطورات الاراء القومية فى اوروبا ،كلية الاداب ،جامعة بغداد.
31. د.مكرم الطالبانى : الحرب هل كانت الخيار الاوحد لحل ازمة الكويت؟،سللسلة كتب الثقافية لدار ئاراس للطباعة والنشر،اربيل ،الطبعة الاولي ،2006.
32. د.محمد السيد سعيد:مستقبل النظام العربي بعد ازمة الخليج،مجلس الوطنى للثقافة والفنون والا داب –كويت ،سلسلة 1992،158.
33. د.محمد السيد سعيد:مستقبل النظام العربي بعد ازمة الخليج،مجلس الوطنى للثقافة والفنون والا داب –كويت ،سلسلة 1992،158.
34. د. نبيل السمان :امريكا وخفايا حرب الخليج من كارتر الى بوش ،عمان ،الطبعة الثانية ،1991 ،تمت الفهرسة بمعرفة دائرة المكتبات والوثائق الوطنية .
35. العميد الركن نجيب الصالحى:الزلزال ماذاحدث فى العراق بعد الانسحاب من لكويت ،رقم الايداع 99،مطبعة خاك،السليمانية.
36. دكتور عمرو عبدالسميع : الحرب ،احاديث الحرب والسلام والديمقراطية ، ،دار المصرية اللبنانية ،طبعة الاولى ،يناير1998 م.
37. غسان العزى : سياسة القوة ،مستقبل النضام الدولى والقوى العضمى ،مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث والتوثيق ،الطبعة الاولى ،بيروت ،2000.

**سێهەم- گۆڤار:**

38.ئیریك ئارنیت :دورنمای هەڵسەنگاندنی هەڕەشەکان : هەڵسەنگاندنی توانای سوپایی و ئەگەری سەرهەڵدانی جەنگ لە باشوری ئاسیا (ئێران، پاکستان، هندستان و چین )، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە شاسوار حسێن، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ،ژمارە 46، مایسی 2005 ،ساڵی سیانزەهەم ، ل 244 لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان ،سلێمانی .

39.بەختیار عەلی :چۆن پاکێتیمان دۆڕاند،گۆڤاری هزر،ژمارە (1)،هاوینی 1998،بڵاوکراوەی مەڵبەندی رۆشنبیری هیوا.

40.ڕێبین ئەحمەد هەردی :شەر،حزب سرینەوەی کۆمەڵگەی شارستانی ،گۆڤاری رەهەند ،ژمارە یەك ،1996.

41.دکتۆر سالارباسیرە:جەنگی دوهەمی کەنداو هۆوئامانجەکانی ،گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان ،ژمارە 2002،37،بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان .

42.د.موسا ابراهیم: فاشیزم و نازیزم، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد، گۆڤاری سەردەم، ژمارە 20، نیسانی 2002، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم .

43.نەریمان کەرکوکی: کەمینە نەتەوەیی وئاینی و مەزهەبییەکانی کوردستان، گۆڤاری بیرو هۆشیاری، بڵاوکراوەی مەکتەبی بیرو هۆشیاری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ژمارە (3)، تشرینی یەکەمی 2002،سلێمانی .

**چوارهەم –رۆژنامە:**

44. ژنان قوربانی یەکەمی دەستی جەنگن، رۆژنامەی راسان، بڵاوکراوەی رێکخراوی راسان، ژمارە (59)، کانونی دووهەمی 2007 ، سلێمانی .

**پێنجەم -ئینتەرنێت :**

45.موسوعە ویکبیدیا، حرب الخلیج الپانیە،((www.mawsoah.net،global . arbic encyclopedia

46.موقع الامم المتحدە,www.un.org..

# بەرهەمە چاپکراوەکانی دەزگای ئایدیا

| ژ | ناوی بەرهەم | نوسەر | وەرگێڕ | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ئاشنابوون بە ئەفلاتوون | ڕێباز مستەفا | | 2014 |
| 2 | ئاشنابوون بە سپینۆزا | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 3 | ئاشنابوون بە کیرگە گۆر | شۆرش مستەفا | | 2014 |
| 4 | ئاشنابوون بە شۆپنهاوەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 5 | ئاشنابوون بە کارل پۆپەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 6 | ئاشنابوون بە ئالان تۆرین | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 7 | ئاشنابوون بە سوقرات | لوقمان رووف | | 2014 |
| 8 | ئاشنابوون بە ئەرستۆ | ڕێباز مستەفا | | 2014 |
| 9 | ئاشنابوون بە قەشە ئاگۆستین | سەرهەنگ عەبدولرەحمان | | 2014 |
| 10 | ئاشنابوون بە جان جاك رۆسۆ | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 11 | ئاشنابوون بە دیڤد هیوم | مستەفا زاهیدی | | 2014 |
| 12 | ئاشنابوون بە نیچە | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 13 | ئاشنابوون بە فرۆید | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 14 | ئاشنابوون بە جۆن لۆك | عەتا جەمالی | | 2014 |
| 15 | ئاشنابوون بە لینین | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 16 | ئاشنابوون بە ئەریك فرۆم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 17 | ئاشنابوون بە قوتابخانەی فرانکفۆرت | عوسمان حەمە رەشید | | 2014 |
| 18 | ئاشنابوون بە بزوتنەوەی فیمینیزم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 19 | بلیمەتی و شێتی | بازگر | | 2014 |
| 20 | ئاشنابوون بە کریشنا مۆرتی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 21 | ئاشنابوون بە سکیۆلاریزم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 22 | ئاشنابوون بە سیمۆن دیبۆڤوار | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |

| 23 | ئاشنابوون بە ڤێرجینیا وۆلف | لوقمات رووف | | 2014 |
|---|---|---|---|---|
| 24 | ئاشنابوون بە یۆرگن هابرمانس | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 25 | ئاشنابوون بە درێدا | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 26 | مەکری ئیسلامییەکانی کوردستان | ماجد خەلیل | | 2013 |
| 27 | کتێبی سور | ماو تسی تۆنگ | فازل حسێن مەلا رەحیم | 2014 |
| 28 | سەیران بۆ سەرێکانی | ستران عەبدوڵلا | | 2014 |
| 29 | گەندەڵی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | | 2014 |
| 30 | یوتۆپیا | کۆمەڵێك نوسەر | پێشەوا فەتاح | 2015 |
| 31 | لە قەندیلەوە بۆ کۆبانێ | ئەنوەر حسێن شۆڕش مستەفا | | 2015 |
| 32 | پریسترۆیکای بەهاری عەرەبی | ئەنوەر حسێن (بازگر) | | 2015 |
| 33 | گەشتە بێ ئاکامەکانی سەرکردەیەك | بریتا بولەر | رێکەوت ئیسماعیل | 2015 |
| 34 | داعش و داعشناسی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 35 | گروپی قەیرانی چارەسەری پرۆسەی ئاشتی نێوان تورکیا و پەکەکە | ماجید خەلیل | | 2015 |
| 36 | گۆڕینی رژێم و شۆڕشەکان ئەو روداوانەی سیستمی سەدەیەکیان سڕییەوە | سەجعان میلاد ئەلقزی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2015 |
| 37 | ئاشنابوون بە بێرکلی | ئەرسەلان حەسەن | | 2015 |
| 38 | ئاشنابوون بە باشلار | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 39 | ئاشنابوون بە دیکارت | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 40 | ئاشنابوون بە هایدگەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 41 | ئاشنابوون بە جیل دۆلۆز 1 | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 42 | ئاشنابوون بە جیل دۆلۆز 2 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 43 | ئاشنابوون بە هانا ئارێنت | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 44 | ئاشنابوون بە هیگڵ | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 45 | ئاشنابوون بە سارتەر | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 46 | ئاشنابوون بە نیچە | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 47 | ئاشنابوون بە ڤۆڵتێر | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 48 | ئاشنابوون بە سلاڤۆی ژیژەك | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 49 | ئاشنابوون بە مارکس 1 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 50 | ئاشنابوون بە مارکس 2 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 51 | ئاشنابوون بە مارکس 3 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 52 | ئاشنابوون بە مارکس 4 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 53 | ئاشنابوون بە مارکس 5 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 54 | ئاشنابوون بە مارکس 6 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 55 | ئاشنابوون بە مارکس 7 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 56 | ئاشنابوون بە مارکس 8 | جەلال حەمید | | 2015 |
| 57 | بۆچی مارکس لە سەرحەق بوو؟ | تێری ئیگڵتۆن | پێشڕەو محەمەد | 2015 |
| 58 | خەوتن لەگەڵ شەیتان | رۆبێرت بایەر | ئەرسەلان حەسەن | 2015 |
| 59 | ئاشنابوون بە فیورباخ | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 60 | ئاشنابوون بە تۆماس مۆر | وریا غەفووری | | 2015 |
| 61 | ئاشنابوون بە شۆپنهاوەر | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 62 | ئاشنابوون بە گرامشی 1 | ئەرسەلان حەسەن | | 2015 |
| 63 | ئاشنابوون بە گرامشی 2 | ئومێد عوسمان | | 2015 |
| 64 | ئاشنابوون بە ئەرستۆ | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 65 | ئاشنابوون بە دیموکراسی | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |
| 66 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ 1 | کۆمەڵێک نوسەر | | 2015 |

| 67 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ 2 | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
|---|---|---|---|
| 68 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ 3 | مستەفا زاهیدی | 2015 |
| 69 | ئاشنابوون بە ئەرکون | د.نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد | 2015 |
| 70 | ئاشنابوون بە فۆکۆ | جەبار ئەحمەد | 2015 |
| 71 | ئاشنابوون بە ئەکیونی | ماجید خەلیل | 2015 |
| 72 | ئاشنابوون بە ئەنگڵس | ئارۆ هەورامی | 2015 |
| 73 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل 1 | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 74 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل 2 | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 75 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل 3 | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 76 | ئاشنابوون بە جاك لاکان | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 77 | ئاشنابوون بە لایبنتز | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 78 | ئاشنابوون بە میکاڤیلی | کۆمەڵێك نوسەر | 2015 |
| 79 | مارکس کێ بوو؟ | د. عبدلعلی مقبل<br>مەجید مارابی جەواد حەیدەری | 2015 |
| 80 | حَركة الحَداثة في الشِعر الكُردي | د. سَرْوَر عَبدُالله | 2015 |
| 81 | فیتنە | هشام جعیط<br>سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2016 |
| 82 | داعش و میلیشییاکان | ئەنوەر حسێن | 2016 |
| 83 | پۆڵ ریکۆر | کۆمەڵێك نوسەر | 2016 |

